ئاناتۆل دارۆف

# مردوخۆرەکان

## مردن و مردو خواردن لەپێناوی نیشتماندا شانازییە

لە فارسییەوە:

بورهان قانع

چاپی سێیەم

خانەی چاپ‌و بڵاوکردنەوەی قانع

٢٨

# مردوخۆرەکان

مردن و مردو خواردن لەپێناوی نیشتماندا شانازییە...

لە فارسییەوە: بورهان قانع

چاپی سێیەم

سلێمانی ٢٠٠٨

کتێب: مردوخۆرەکان

بابەت: یاداشت

نوسینی: ئاناتۆل دارۆف

وەرگێڕ: بورهان قانع

نەخشەسازیی: ئازاد حاجی

هەڵەچن: باوکی پامێر

چاپی یەکەم: چاپخانەی ( الحوادث)– بەغداد ١٩٨٤

چاپی دووم و سێییەم: خانەی چاپو بلاوکردنەوەی قانع

تیراژ: هەزار دانە

پێشکەشە بەو کەسانەی:

**لە ڕێگای گەل و نیشتمانەکەیاندا خۆڕائەگرن و**

**لەبەردەم دوژمندا چۆك دانادەن.**

بورهان قانع

١٩٨٤

ئەوەی بەسەر ئەو شارەدا هات، هەتا هەتایـە نموونـــەی قارەمـــانێتیو گیـــانی خـــۆراگریو نیشتمانپەروەری خەڵکی لینینگرادە.

وەرگێڕ

## پێشەکی

نیشتمانپەرستی کارێکی سادەو ئاسان نییە، قوربانیدانو لەخۆبوردن، لەپێناوی نیشتماندا ئەرکی سەرشانی هەر هاولاتییەکە.

ئەم کتێبە بچکۆلەی لەبەردەستدایە، بەسەرهاتی رۆڵی ئازایەتیو خۆڕاگری خەلکی شاری لینینگرادتان بۆ ئەگێڕێتەوە، کەچۆن لەکاتی دووەمین جەنگی جیهانیدا خۆیان لەرووی لەشکری داگیرکاری نازییەکان راگرت، تا ئەورادەی مێژوو بەسەرسامییەوە بۆمان ئەگێڕێتەوە، راوەستان نیشتمانەکەیان نەدا بەدەست دوژمنەوە، با ئەمەش نموونەی خۆڕاگریو فیداکاری بێ بۆ هەر هاوولاتییەکی ئێمەش.

مەبەست لەگۆڕینی ئەم کتێبەو چاپکردنی، ئەوە نییە بەشانو باڵی کەسدا هەڵبدەین، هەرچەند شایانی ئەوەشن.. بگرە مەبەستی سەرەکیمان ئەوەیە: ئەو گیانی خۆراگریو نیشتمانپەرستییەی خەلکی لینینگراد ببێتە سەرمەشقی

گیانی خۆراگریو بەرگەگرتنی گەلەکەمان لەهەر بوارێکی مێژوویی تاڵو پڕ لەناسۆردا.

نوسەری کتێبەکە، ئاناتۆلی دارۆف.. خۆی یەکێك بووە لەو مردوخۆرانەی لەشەڕەکەدا خۆراگربووە[1]. نووسەر، باسەکەی وەکو ڕووداوێك، یان بەسەرهاتێك بۆ گێراوینەتەوە بۆ ئەوەی دەوری هاندەری خۆی ون نەکات، ئێمەش هەر بەوشێوەیە کردمان بەکوردی، سەرباری ئەوەی لەچەند شوێنێکدا کورتە دەسکارییەکی کەممان کردووە، ئەویش نەك بەورادەیە کە کاربکاتە سەرتێکدانی مەفهومی باسەکە، یان لەڕەووشتی وەرگێران بچێتە دەرەوە.

نوسەر، کتێبەکەی بەچوار بەش نوسیوە، ئێمەش هەر کردمان بەچوار بەشەوە... بەڵام هەندێك وشەمان گۆڕیوە بەوشەیەکی تر، ئەویش بۆ ئەوە بووە کەلەسەر زار سوكو ئاسان بێت.

ئیتر سوپاسی هەموو ئەو خوێنەرە بەڕێزانە ئەکەین، کە ڕێزی هەموو بەرهەمێکی ئەدەبی بەرادەی شیاوی خۆی ئەگرن.

**بورهان قانع**

[1] پارچە نوسراوێك لە مۆزەخانەی ( ئەرمیتاج)دا ئەڵێت، لە سەرەتای برسێتی شارەکەدا، مشك لە شارەکەدا نەما، هەموویان خوارد.

کاتێک شەڕ دەستی پێکردو سوپای ئەڵمان ویستی شاری لینینگراد داگیربکا، خەڵکی شارەکە هەموو تێکرا کە زانیان نیشتمان‌و شارەکەیان کەوتۆتە مەترسی داگیرکردن‌و وێرانکردن، بۆ ئەوەی بەرگری لەسەر شارەکەیان بکەن، بەگورجی کوتنە خۆ.

خەڵکی روسیە پێچەوانەی خەڵکەکەی ئەورووپای رۆژئاوا، لەکاتی هەر جۆرە فیداکارییەکدا ئەوەندە خۆیان سەرقاڵ ناکەن.. بۆ بەرگرتن لەسەر پاراستنی شارەکەیان گەورەترین فیداکاریان کردووە.

ئەو خەڵکە هەمەجۆرەی، جگەلەوە بەرەوشت نیشتمانپەروەرن، ئەیانویست ئەوە بـ بەلمێنن کەئەتوانن شارەکەیان بپارێزن‌و شیاوی ئەوەیە هەمیشە بەناوەدانی خنجیلانەیی بمێنێتەوەو دانیشتوانەکەشی هەمیشە شانازی بە شارستانێتی باری پێشکەوتنیەوە بکا.

من[1]، لەو باوەڕەدا بووم ئەگەر سوپای ئەڵەمانیەکان لەدووەمین شەڕی جیهانیدا توانای داگیرکردنی هەر شارێکی تریان هەبایە، نەیانئەتوانی وەکو بەخۆیاندا رائەبینی یان ئەیانویست، بتوانن ئەو شارە بگرن.. مەگەر تا ئەورادەی سەرجەمی ژن و پیاواتی شارەکەیان بکوشتبایە.

دوای ئەوە شەڕەکە دەستیپێکرد، ئەوکات قوتابی دانشگابووم[2]. بەهۆی ئەوەوە کە تاقیکردنەوەمان تەواو بوبوو، توانیم بەشداری شەڕەکە بکەم.

لەسەرەتای پەلاماری ئەڵەمانەکاندا بۆ سەر شارەکەمان، فەرماندەی بەرگریی شار پێی وتین:

**"پێویستمان بەسەرباز گرتن نیە، بەڵکو هەندێک خەڵکمان ئەوێت بۆ ئەوەی خەندەکێکی قووڵ بەهەر چواردەوری شارەکەدا هەڵکەنن و دەوروبەری شارو شوێنە دەرکەوتووەکان هەموو بکەنە سەنگەر".**

[1] واتا نوسەری کتێبەکە – ئەناتۆل داروف. - وەرگێڕ-
[2] هەمان نوسەری کتێبەکە. - وەرگێڕ-

**هەروا پێی وتین ئەبێت:**

"سەرەتای سەنگەرەکان تارادەیەک لەشارەکەوە دووربێت، دوای ئەوەش چەندان سەنگەری تر لەشوێنە جۆربەجۆرەکاندا، تا ئەگاتە شار، یەک لەپشت یەکترەوە هەڵبکەندرێن.

ئێمە[3] دەستمانکرد بەسەنگەر هەڵکەندن، کە ئەڵێم ئێمە، مانای چوار ملیۆن خەڵکی دانیشتوانی شار[4].. ئەمە جگە لەو کرێکارانەی لەکارخانەو فابریقە دەوڵەتییەکاندا کاریان ئەکرد، جگە لەو هەموو ژن و پیاوە پەککەوتەو منداڵانەیش کە لەشارەکەدا بوون.

قازیی دادگاو داوەرو مامۆستای دانشگاو ژنە هونەرپیشەکان و... بەکورتی تێکڕای دانیشتوان هەر لەگەورەترین بەڕێوەبەری دەزگاو دامەزراوەکانەوە، تا بچوکترین کارگوزاری دەوڵەت لەگەڵ تێکڕای خەڵکدا، هەموو ڕۆژ، هەر لەبەرە بەیانەوە بە پاچ و بێڵ هەڵکەندن لەشار ئەهاتنە دەرەوەو تا ئێوارە لەو دەشتە خەریکی سەنگەر هەڵکەندن ئەبوون.

کرێکاری ئاسایی ڕۆژانە هەشت سەعات کاری ئەکرد، بەڵام ئێمە[5] هەموو ڕۆژێک نزیکەی ١٧ سەعات کارمان ئەکرد، ژنان لەپاش نیو سەعات ئیشکردن– یان زیاتر– لەسەنگەرەکەندا شەکەت ئەبوون، لەجیاتی پرچ شانە کردن و گوڵاو پژاندن بەسەرو لەشیانا، هەموو پرچەکانیان بەجۆرێک پڕ بوبوو لەخۆڵ، کە

[3] واتا خەڵکی شاری لینینگراد. — وەرگێڕ.
[4] لەو کاتەدا دانیشتوانی شارەکە چوار ملیۆن کەس بووە.
[5] واتا خەڵکی شاری لینینگراد. — وەرگێڕ.

بەئاستەم ئەناسرانەوە. هەوای گەرمو تیشکی خۆر گەلێك لەو خەڵکە تیشکەرانەی شپرزە کردبوو، بەڵام کەس گوێی بە ماندوبوون و گەرما نەئەدا.. چونکە ئامادەبوون هەموو جوانیو خۆشییەکیان بکەن بەقوربانی شارو نیشتمانەکەیان.

**لەو کاتەدا ناوشار ئازوخەی تەواوی تیابوو، هێشتا برسێتی دەستی پێ نەکردبوو، خەڵك ئەوەندە بەشوێن خۆراکدا نەئەگەڕا، دەوڵەت فەرمانێکی دەرکردبو کە هەموو شت لەناوبەرن بۆ ئەوەی لەکاتی داگیرکردنی شارەکەدا -لەلایەن ئەڵمانەکانەوە- هیچ شتێك نەمێنێت بکەوێتە دەست ئەڵمانەکان.**

مەبەست لەمەیش ئەوەبوو ئەگەر ئەڵمانەکان هاتنە شارەکەوە، نە سوتەمەنیان دەست بکەوێ، نەخۆراك.. ئەم فەرمانە دەقاندەق جێبەجێکرا.

لەدەوروبەری شار کێڵگەی پەتاتەی زۆری تیابو، لەو کاتەدا پەتاتەش پێگەیشتبوو، ئەگەر بەڕێوەبەرانی شار چەند سەد کەسێکیان تەرخان کردبایە پەتاتەی کێڵگەکان کۆبکەنەوەو لەناو شاردا هەماری بکەن، بەوجۆرە برسێتی ئەوەندە خەڵکی نەئەکوشتو خەڵك بەوجۆرە لە برسانا شپرزە نەئەبوون و نەئەمردن..

بەڕێوەبەرانی شار بیریان لەئازوخەی چەند مانگی دڵهاتوی چوار ملیۆن خەڵکی شار نەئەکردەوە، فەرمانیاندا پەتاتەی کێڵگەکان هەموو لەناویەرن بۆ ئەوەی ئەگەر شارەکە گیرا، نەکەوێتە دەست لەشکری ئەڵمان.

ئەگەر کەسێك بیبیستبایە چوار ملیۆن کەس خەڵکی ناوشار-جگە لە کرێکاری کارخانەو فابریقەکان، کە چەکو تەقەمەنیان دروست ئەکرد- هەموو لەسەنگەرەکان خەریکی پاچکارینو سەنگەری دژی تانگ دروست ئەکەن، سەری سوڕئەما کە ئەمانە چۆنو بەچی ئەژین؟! چونکە لەکاتێکدا هەموو خەڵکی شار هەر لە بەرەبەیانەوە بچنە دەرەوە بۆ سەنگەر هەڵکەندنو ئێوارە بگەڕێنەوە بۆ ناو شارو هیچ کارێکیان نەبێت بۆ دابینکردنی پێداویستیەکانی ژیانیان.. ئەی گوایە بەچی ئەژین؟!.

**یەکێك لەهۆیە گرنگەکانی پاراستنی شار-کەلەو کاتەدا دوستیان کرد- خەندەکێکی قووڵ بوو، کە بەهەر چواردەوری شارەکەدا هەڵکەندرا بوو..**

لەو باوەڕدانیم لەهیچ سەردەمێکی مێژوودا، خەندەکێکی بەوجۆرە فراوانو قووڵ بەدەوری هیچ شارێکدا هەڵکەندرابێت.. تاقیکردنەوەش دەریخست ئەو خەندەکە، لەو کاتەدا کارێکی تەواو پێویستو بەجێ بوو، چونکە کاتێك لەشکری ئەڵەمان هەموو سەنگەرەکانی دەوروبەری شاری گرتو گەمارۆی شارەکەی دا، هەرچەند هەوڵیاندا نەیانتوانی لەو خەندەکەوە بپەڕنەوە بۆ ناو شار.. ماوەی سێ ساڵ لەشکری ئەڵەمانەکان لەوبەری خەندەکەوە راوەستان، تا ئەوکاتەی تێکشکانو دەرکران.

ئەو خەندەکە لەجیاتی ئاو پڕ بوبوو لەخوێن، لەناو ئەو خەندەکەدا تەنیا مشتێك خاك نەمابوو بەخوێنی پەلاماردەران، یان بەرگریکاران سور نەبوبێت.. یان نەبوبێت بەقوڕ.

ئەو شوێنەی من سەنگەرم تیا هەڵئەکەند، لەنزیك گوندێکەوە بوو بەناوی "ریباتز کویە"، ئەو گوندە لەکاتی شەڕدا بەتەواوی وێران ببوو. بەلام لەوکاتەدا کە ئێمە سەنگەرەکانمان هەڵئەکەند، گوندێکی ئاوەدان و خنجیلانە بوو، ژمارەی ئەو خەڵکانەی هاتبوون بۆ ئیشکردن ئەوەندە زۆر بوون لەسەر ئیشەکە، بەئاسانی جێگامان نەئەبۆوە، ئەوەشمان نەئەزانی ئەم هەموو خەڵکە لەو دەشتەدا کار ئەکەین، چۆن هۆیەکانی تەندروستی و ژیان دابین بکەین.

بۆ ئەوەی ئیشەکەمان دوانەکەوێ، ئەوانە لەوێ ئەمایینەوەو نەئەڕۆیشتینەوە بۆ ناو شار، لەدوورەوە دوکەڵی دوکەڵکێشی کارخانەکانمان ئەبینی.. ئەوانە لەناو چاڵ و سەنگەرەکانا ئەمایینەوە، ژیانی ئێمەش وەکو ژیانی سەربازەکانی ناو سەنگەری لێهاتبوو، جیاوازیمان هەر ئەوەندەبوو کە ئێمە بێ چەك بووین.. بەڕۆژدا ژنان و پیاوان پێکەوە کاریان ئەکرد، ئەوانەش هەر دەستە بەجیا لەسەنگەرەکانا ئەخەوتین.

لەسەرەتادا دوژمن پەلاماری نەدایین، بەلام لەسەرەتای مانگی تەموزدا[١]، فڕۆکە شەڕکەرەکانی ئەڵەمان بەتوندی پەلاماری سەنگەرەکانیان داین. من یەکەمجارم بوو کەچاوم لەفڕوکەی شەڕکەرەوە بێت، کە چۆن بۆمبا فڕێئەدات و شەڕئەکات.

هەر لەگەڵ هاتنی فڕۆکەکانی ئەڵەماندا، تۆپە تەیارە شکێنەکانمان کەوتنە دەستڕێژو ئاگر بارانکردنی فڕۆکەکان و دایانگرتن.. ئێمەش وەکو جاران خۆمان لەناو سەنگەرەکانا متکرد، پۆلێك لەفڕۆکەکانمان لەگەڵ فڕۆکەکانی دوژمندا

[١] بەرامبەر بە مانگی ژوئیە.

لەئاسمان کەوتنە شەڕەوە، بەلام نەیانتوانی فرۆکەکانی دوژمن دەربکەن و دوریانبخەوە، فرۆکەیەکی دوژمن هاتە سەر سەرمان، هەرچەند لەلایەن تۆپە شەشیرەکانمانەوە تەقەی لێکرا نەگەڕایەوە، شتێکی رەشی لەسەرمان بەردایەوە، ئەمەس بۆمبابوو، کەوتە ناو سەنگەرەکەی ئێمە.. چوار کەسی لێ کوشتن و چەند کەسێکیشی بریندارکرد.. کە ئەمەم دی، ئینجا لەشەڕو لە ئازاری شەڕ تێگەشتم.

سەرلەئێوارەی هەمان ڕۆژ[٧]، دەستەیەك فرۆکەی تری ئەلەمانەکان هاتن، بەلام فرۆکە شکێنەکانمان ئەمجارە توانیان یەکێکیان لێ بخەنەوە خوارەوە، دوای ڕۆیشتنی فرۆکەکان، کچە ئیشکەرەکانی ناو سەنگەرەکان رایانکرد بۆ لای تۆپچییەکانمان و ئەملاوئەولایان ماچ ئەکردن و سوپاسیان ئەکردن.

لەرۆژی سێیەمی مانگی تەموز بەدواوە، مەترسییەکی زۆر کەوتە ئیشکردنەکەمانەوە، چونکە رۆژ نەبوو چەندان فرۆکەی دوژمن نەیەتە سەرمان و پەلامارمان نەدەن و چەندان ژن و پیاومان لێ نەکوژن.

رۆژێکیان شەمەندەفەرێکی پڕ لەمناڵ لەشاری لینیگرادەوە دەرچوو، بۆ ئەوەی مناڵەکان لەئاگری شەڕ دوربخاتەوە، لەوکاتەدا پۆلێك فرۆکەی دوژمن هاتن و شەمەندەفەرەکەیان بۆمبا باران کردو سوتاندیان و هەموو مناڵەکان کوژران..

هەموو رۆژ، رۆژی چەند جارێك فرۆکەی دوژمن ئەهاتنە سەر سەنگەرەکان و بەتایبەتی خەندەکەکەیان بۆمباران ئەکرد.. بەلام هیچ پەلاماری شارەکەیان نەئەدا، لەکاتێکدا کە بە ئاسانی ئەیانتوانی شارەکەش بۆمبباران بکەن و هەمووی وێران بکەن.

[٧] هەمان سەرەتای مانگی تەموز دەگرێتەوە.

فڕۆکەکانی ئێمە نەیانئەتوانی بەر لەفڕۆکەکانی دوژمن بگرن، ئێمە نەمانئەزانی بۆچی دوژمن سەنگەرەکانی ئێمە بۆمبباران ئەکات، کەچی دەست لەسەربازگەکانی ناو شارو ئەو کارخانانەی چەك دروست ئەکەن، ئەپارێزن.

لەدوای شەڕەکە ئەم هۆیە دەرکەوت کە ئەڵەمانیەکان ئەیانویست بێ ئەوەی شارەکە وێرانبکەن بیگرن‌و دەست بەسەر تەواوی کارخانەکاندا بگرن، ئەڵەمانیەکان وایان دانابوو بەلای کەمەوە تا ڕۆژی ١٥ی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤١، ئەبێت تەواوی شارەکانی ناوچەی ژوورو بگرن، لەبەرئەمەبوو نەیانئەویست شارەکە وێران بکەن، بۆ ئەوەی کاتێك شارەکانیان داگیرکرد، دەست بەسەر هەموو ئەو کەلوپەل‌و کارخانانەشدا بگرن‌و تالانییەکانیان لەناونەچن، بەتایبەتی کە ئەیانزانی هەموو زێڕی پاشەکەوتەی وڵاتی سۆڤییەت لەشاری لینیگراددایە.

ئەو سەنگەرانەی کەویستمان تەواوبون، ئینجا چوین بۆ شوێنێکی تر، بۆ ئەوەی سەنگەری دژی تانك هەڵکەین، لەو کاتەدا نزیکەی هەشت سەد هەزار کەسێك خەریکی هەڵکەندنی خەندەکە قوڵەکە بوون، هیچ شارێکی تری ئەو وڵاتە خەندەکی بەوجۆرەی بەدەورا نەکێشرا بوو.

بەڵام لەکتێبە مێژووییەکاندا زۆرجار ئەوەم خوێندۆتەوە کە لەسەردەمی کۆندا بۆ پارێزگاری شارە گەورەکان، چەندان خەندەکیان بە دەوری شارەکاندا هەڵئەکەند، بۆ ئەوەی دوژمن زەفەریان پێ نەبات.

ئەو خەندەکە بەهۆی قووڵی‌و گەورەییەوە، توانی بەربگرێ لە هێرش‌و پەلاماری ئەڵەمانییەکان، خەندەکەکە بازنەیی نەبوو، هێلکەیی نەبوو،و تەنانەت چوارگۆشەو لاکێشەیش نەبوو.... بەڵکو وەکو پشتێنێك بوو، بەڵام بەشێوەی شکاوە.

سێ ڕیز سەنگەر لەپشتەوەی خەندەکەکە دروستکرابوو، بۆ ئەوەی ئەگەر ڕیزی یەکەمو دووەم گیران، ڕیزی سێیەم بتوانێت ڕێگری لەپەلاماری دوژمن بکات، بەجۆرێك خەندەکەکە هەڵکەندرابوو، ئەگەر دوژمن لەهەر شوێنێکیدا بیویستبایە پەلاماربدات، ئەکەوتە بەر ئاگری دەستڕێژی سەنگەرەکانی دواوە.

لەهەندێك شوێنی خەندەکەکەدا، گلۆپی تیشك هاوێژیان دانابوو، کەرووبەرێکی زۆری لەدوری خەندەکەکەوە ڕۆشن ئەکردەوە.. لێپرسراوان نەخشەی پاراستنی شارەکەیان بەر لەپەلاماری ئەڵەمانیەکان دانابوو، چونکە پێشبینی ئەوەیان کردبوو ئەڵەمانیەکان پەلاماری شارەکە ئەدەن، هەروەکو لەدوای شەڕەکە دەرکەوت کەنەخشەی پاراستنی سەرتاسەری وڵات هەر لەساڵی ١٩٣٨ەوە دانرابو، واتا بەسێ ساڵ بەر لەپەلاماری ئەڵەمانیەکان، لەو کاتەوە کەئەڵەمانیا زۆری بۆ وڵاتی چیکۆسلۆڤاکیا هێنابوو، داوای ناوچەی "سودت"ی ئەکرد، کە لەدواییدا بوو بەداواکردنی تەواوی چیکۆسلۆڤاکیا.

خەڵکی شار بەچەرخو مەکینەی گەورە، خەندەکەکەی دەوری شاریان هەڵکەند. یەکێك لە کارخانەکانی شار، بەپەلە ژمارەیەکی زۆر مەکینەی گەورەی گڵ هەڵکەندنی دروستکردو خستیانە ئیش. لەپشتی خەندەکەکەوە، دیوارێکی گڵینی بەرین کە چوار مەترە بەرزلییەکەی بوو دروستیانکرد، لەسەر دیوارەکەوە هەر ماوەیەك چەندان سەنگەری پاشکەواتی بەزنجیرە تیا دروستکرابوو.

لەدوای دروستکردنی سەنگەرەکان تێکرای خەڵك دەستیانکرد بەهەڵکەندنی خەندەکەکە، نزیکەی دوو ملیۆن ژنو پیاو لەو خەندەکەدا ڕۆژانە ئیشیان ئەکرد، گەلێك لەو ژنو پیاوانە لەکاتی ئیشکردنا بە بۆمبای ئەڵەمانیەکان کوژران... لەڕۆژێکدا زیاتر لە ١٠٠ تا ٢٠٠ کەس بەهۆی بۆمبای فڕۆکەی ئەڵەمانیەکانەوە ئەکوژرانو ژمارەیەکیش بریندار ئەبوون.

لەوکاتەدا کەخەریکی کارکردن بووین، وەکو نیشانەیەکی دیاری فرۆکەکانی ئەڵەمان وابووین.. بەدلخەوە فرۆکەکانی ئێمە توانای بەرگریکردنی فرۆکەکانی ئەڵەمانیایان نەبوو..

دەوڵەت ئاگادارینامەی چاپ ئەکرد کە گوایە ئائێستا هیچ فرۆکەیەکی ئەڵەمان نەچۆتە ئاسمانی شارەکەوە، ئەمە قسەیەکی راست بوو؛ چونکە جگە لە فرۆکە هەواڵدزەکان، هیچ فرۆکەیەکی ئەڵەمانی تا ئەوکاتە نەچویونە سەر شاری لینینگراد، ئەمەش لەبەرئەوەنەبوو کەتۆپە دژە ئاسمانییەکانی ئێمە رێگایان نەئەدان، بەڵکو هەر خۆیان خۆبەخۆ نەیانئەویست بچنە ئاسمانی شارەکەوە.

بەرلەوەی هێزەکانی دوژمن بگەنە دەوروبەری شار، ئەوەندە لە کرێکاران‌و ئیشکەرەکانی ناو خەندەکەکە کوژران کە رەنگی خەندەکەکە ئەرخەوانی بوبوو.. لەبەرئەوەی ئەڵەمانیەکان بەگورجی ئەهاتن، ئێمە بۆمان نەئەکرا وەکو چۆن ئەمانەوێ خەندەکەکە تەواوبکەین، بەڵام توانیمان دوو لایەنی شار تەواوبکەین‌و رێگای هاتوچۆو هاتنی ئەڵەمانیەکان بگرین..

روکارێکی تری شارەکە دەریا بوو، ئەوەیان پێویستی بەخەندەك نەئەکرد، کاتێك هێزی ئەڵەمانیەکان بەری رۆژهەڵاتی شارەکەیان گرت، ئیتر ئێمە نەمانتوانی خەندەکی تیا هەڵکەنین.

هێزە داکۆکیکارەکانی شار[*] ، واتا هێزە بەرگریکارەکان، ئاویان ئەکردە خەندەکەکەوە، ئەمەش لەبەردوو هۆ بوو.

[*] ئەو هێزە گەلییانە بوون کە بووبونە پشتیوانی هێزە سەربازییەکان..

**یەکەم:**

**خەندەکەکە نزیکەی شەست مەتر پان بوو، لەهەندێک شوێنیشدا ئەگەیشتە هەشتا مەتر... پڕکردنی لەئاو شتێکی ئاسان نەبوو، ئاوی رووباری "تڤا" کە بەناو شاردا ئەڕۆیشت، بەسەر خەندەکەکەدا زاڵ نەئەبو، هەروەها لەدەریاشەوە پڕ نەئەکرا، لەبەرئەمە ناچار ئەبوون لەئاوی خواردنەوەی ناو شارەکە خەندەکەکە پڕبکەن، کەئەمەش کارێکی زۆر گران بوو. چونکە خەڵکی شاری بێ ئاو ئەبون، لەو هاوینەدا جگە لەمەینەتی شەڕەکە، دوچاری چەندان جۆر نەخۆشی ئەبوون.**

**دووەم:**

**لەبەر ئەوەبوو، ئەگەر پڕبکرابایە لەئاو، دوژمن بەئاسانی ئەیتوانی پردی بەسەردا ببەستێ و بەسەریا بپەڕێتەوە بۆ ناو شارەکە..**

بەڵام پەڕینەوە لەخەندەکێکی بێ ئاو، کارێکی زۆر گران بوو.

دیوارەکانی خەندەکەکە وەکو کۆڵەکە وەستابوون، تەنانەت پشیلەش بەئاسانی نەیئەتوانی بەسەریا سەرکەوێتە سەرەوە، جگە لەوەش چەندان سەنگەری پاشکەوان کەبە سەر خەندەکەکەدا ئەیانڕوانی، دروستکرابوون و بە هۆیەوە سوپای ئەڵمان تواناى نەبوو پێ بخاتە ناو خەندەکەکەوە.

جگە لەو هۆیانەی لەسەرەوە باسکران، دوای ئەوە کە گەمارۆدانی شارەکە در`ێ`ەی کێشاو زستان هاتە پێشەوە، دەرکەوت کە ئاو نەکردنە خەندەکەکە

کارێکی ئاقڵانە بوو، چونکە ئەگەر خەندەکەکە ئاوی تیابوایە، زستان ئەبووە سەهۆڵو بەئاسانی دوژمن بەسەریا ئەپەڕایەوە بۆ ناو شار.

لەشکری ئەڵەمان دوای ئەوە لەهەموو ناوچەکانی ئەوروپا سەرکەوت، کاتێك بەو خەندەکە گەیشت نەیتوانی بڕوات، بەپێچەوانەی نەخشەی ئەڵەمانیەکان پەلامارەکەیان بۆ سەر شاری لینینگرادو وەکو خۆیان ئەیانویست داگیرکردنی وستا. لەگەڵ ئەوەشدا لەهەموو ناوچەکانی تر سەرکەوتبوون، تەنانەت گەیشتبوونە روباری "ڤۆلگا"و پێیان نابووە شاری "تزاریت زین"ی کۆن کە لە دواییدا ناونرا "ستالینگراد". بەڵام هەرچەند هەوڵیدا نەیتوان بچێتە ناو شاری لینینگرادەوە.

لەکاتی هەڵکەندنی خەندەکەکەدا، زۆرجار ئێسقانی مردو لەژێر خاکەوە ئەدۆزرایەوە، هاورێکانم ئەیانوت شاری "بطرس پۆرگ"[9] لەسەر ئێسقانی ئەو کرێکارانە بونیادنراوە کە لەکاتی کردنەوەی شارەکەدا مردون.

دوای ئەوەی پەلاماری گشتی ئەڵەمانیەکان دەستی پێکرد، ئەمانوت ئێمەش ئەمرینو جارێکی تر لەسەر ئێسقانی ئێمە شارەکە بونیادئەنرێتەوە.

سەرۆکی بنەماڵە ئاینیەکان، یان یەکێتییە مەزهەبییەکان، چەندان نوسراویان بەدیوارو شوێنە گشتییەکانا هەڵواسیبوو،و تیایاندا نوسیبویان:

**"رۆژی راپەرینە، مەسیح لەسەر چیا بەرزەکان وەستاوە، خۆتان بۆ پێشوازی مەسیح ئامادەبکەن، تۆبە بکەن لەخوا بپارێنەوە بەڵکو خواوەند بتان بەخشێت".**

---

[9] یان "پترزبورگ"...

هەندێک جاریش ئاگادارینامە بە بەناوی سەرۆکی ئەنجومەنی شارەوە دەرئەچو، داوای لەخەڵک ئەکرد چاوەڕوانی سەرکەوتن بن.

خەیارو تەماتەو پەتاتەو نان و شەکرو چاو هەموو جۆرە ئازاوخەیەک ئارادەیەک لەو کاتەدا زۆربوو، بەڵام گۆشت نەبوو، یان ئەگر هەبایە زۆر دەگمەن بوو، خەلکی شار لەجیاتی گۆشت، تەماتەو بیبەریان پێکەوە ئەبرژاندو ئایانخوارد، تا کۆتایی مانگی تەمموز نەهەست بە برسێتی ئەکراو نەبە کەمی ئازوخە لەناو شاردا.

لەسەرەتای مانگی ئابی ساڵی ١٩٤١دا، گۆشت زۆر نایاب بوو، تەنانەت بەهیچ جۆرێکو لەهیچ لایەکی شاردا دەست نەئەکەوت. دوای ئەوەش دەسەندەی نانی رۆژانەش کەم بۆوە، بەڵام دانەوێڵە -بە تایبەتی ماش و نیسکو پەتاتە- هێشتا زۆر بوو.

لەنیوەی یەکەمی مانگی ئابدا دانەوێڵەش بەرە بەرە کەم بۆوە، بەجۆرێک لەکۆتایی ئابدا گەیشتە رادیەک نە پەتاتەو نەتەماتەو نەماش و نەنیسکو تەنانەت هیچ جۆرە دانەوێڵەیەکی تر دەست نەئەکەوتن.

یەکێک لەمامۆستایانی دانشگا -ئەگەرچی بەتەمەن زۆر پیربوو، خەریکی سەنگەر هەڵکەندن بوو لەگەڵماندا، رۆژێک لەکۆتایی مانگی ئابدا، کاتێک کەمەنجەڵێک نیسکێنەمان لێنابوو خەریکی نان خواردن بووین، لەناو سەنگەرەکانا وتی:

**"کوڕەکان! نرخی ئەم نیسکێنەیە بزانن، وەکو من هەست ئەکەم ئەمە دوا نیسکێنەیە کەیخۆین".**

کە نیسك تەواوبوو، ئینجا دە سەندەی نان بەشی نەئەکردین‌و تێرمان پێ نەئەخوارد، ئیتر لەو رۆژە بەدواوە نیسك‌و ماش‌و هیچ جۆرە دانەوێڵەیەکی تر لە شاردا نەما، تاکو لێ بنرێن.

یەکەمجار لەمانگی ئەیلولدا هەستم بەبرسێتی کرد[10] خەڵکێکی زۆریش وەکو من برسی بوون بەشوێن خواردندا ئەگەڕان، وتیان لەیەکێك لەشەقامەکانی شاردا هەموو جۆرە خواردنێك هەیە، تەنانەت گۆشتی "گا" ئەفرۆشن، رۆیشتم بۆ شەقامەکە لەیەکێك لەدوکاندارەکانم پرسی، ئەویش وتی: هەموو شتێکم هەیە، بەڵام بەزێڕ ئەیفرۆشم، وتم ئەی بۆچی بە "ئەسکەناس"ی نافرۆشی[11]؟ وتی: "ئەسکەناس"ی روسی ئەویش وەکو (منات)ی تزارییەکانی لێ دێت‌و بەهای نامێنێت[12].

لەیەکەمین جەنگی جیهانیدا، هیچ کەس بە بیریدا نەئەهات کە "منات"ی تزاری دوچاری نوشوستی ئەبێت‌و لەبازارەکانی ناوخۆو دەرەوەدا بەهای خۆی ئەدۆڕێنێ.. بەڵام لەدواییدا وای لێهات بچوکترین ئەسکەناسیان بە "٥٠٠" پێنج سەد هەزار "منات" ئەچو.

---

[10] بەزمانی نوسەری کتێبەکەوە وتراوە...

[11] پارەی روسی ئەو سەردەمە بووە... کە مامەڵەی پێکراوە.

[12] منات... لەکاتی یەکەمین جەنگی جیهانی‌و بەر لەسەرکار لاچونی تزارییەکان، لە زۆربەی بازارەکانی دەرەوەو ناوخۆدا بەهای نەما.

ئیتر لەو کاتەوە تێگەیشتم کەبازرگان و دوکاندارەکان لەدوارۆژی ئەسکەناسی روسی ئەترسن و لەو باوەڕەدان ئەویش نرخی نامێنێت.

مامۆستایەکی دانشگاکەمان کەبیستی لەبازاڕی رەشدا پارەی ئەسکەناسی روسی وەرناگیرێت، وتی:

**"ئیتر نامەوێت بژیم، بەلام لەگەلّ ئەوەشدا دلّنیانن ئەگەم کەولاتەکەمان ئەم شەڕە نادۆڕێنیّ و هەر سەرکەوتو ئەبێت و هەر سەرئەکەوێت".**

لەسەرەتای مانگی ئەیلولدا، برسێتی و پەلاماری ئەلّەمانیەکان هەردوکیان بەیەکجارو لەهەموو لایەکەوە دەستیانپێکرد، هێزی زۆری دوژمن لەرۆژئاوای شارەوە زۆر بەتوندی پەلاماری شارەکەی ئەدا.

هەرچۆن بوو، ئەلّەمانیەکان توانیان بەهۆی تانك و چەکی قورسی زرێپۆشەکانیانەوە ئەو سەنگەرانە بگرن کە لەدەرەوەی شار هەلّکەندرابوون، لەسەرەتاوە ویستیان پرد بەسەر خەندەکەکەی دەوری شاردا ببەستن، بەلام ئەو دەستە سەربازیانەی هاتبون بۆ بەستنی پردەکە، هەموویان کوژران.

پاش چەند رۆژێك هەموو ئەو لاشە کوژاوە ئەلّەمانیانەی لەسەر خەندەکەکە کوژرابوون، بۆ گەنیان کرد، ئەلّەمانیەکان نەیانئەتوانی لاشەی سەربازە کوژراوەکانیان لەخەندەکەکە دەربکەن و بیانبەنەوە. دوای ئەوە لەبەستنی پرد دلّنیابوون کە بۆیان نابەستریّ و توانای ئەمکارەیان نییە، ئینجا ویستیان دیواری پشتیوانی خەندەکەکە بشکێنن، بەلام لەسەنگەرەکانی پشت خەندەکەکەوە درانە بەر دەستڕێژو ژمارەیەکی زۆریان کوژاو زۆریان لێ بریندارببو، ئەواني تریشیان هەلاتن و پاشەکشەیان کرد.

لەکاتێکدا ئەڵەمانیەکان لەبەری ڕۆژئاوای شارەکەوە خەریکی خۆ ڕێکخستنو پەلاماردان بوون، ئێمەش لەلای ڕۆژهەڵاتەوە خەریکی هەڵکەندنی خەندەکو دروستکردنی سەنگەرو قایمکردنی دیواری سەر خەندەکەکە بووین، دوای ئەوە خەندەکەکە لەهەموو لایەکەوە هەڵکەندراو بەئەندازەی پێویست تەوابوو، ئەوکاتە خەڵکی شار هەموو دڵنیابوون کە ئیتر دوژمن ناتوانێت لەناکاو دزەبکاتو پەلاماریان بداتو زەفەریان پێ ببات.. ئەڵەمانیەکان زۆرجار تاکتیکی تازەیان بۆ پەلاماربردن دائەناو ئەیانویست پەلامای شارەکە بدەنو شارەکە داگیرکەنو دەست بەسەر هەموو ئەو کارخانەو فابریقەو دەزگاو دامەزراوە ئابوریانەدا بگرن کەلەشارەکەدایە، بەڵام هەموو جار تێك ئەشکانەوە.

لەدووەم ڕۆژی مانگی ئەیلولدا، لەشکرێکی زۆری چەتربازی ئەڵەمانی لەناکاو لەپشت سەنگەرە بەرگرییەکانەوە دابەزین، بەڵام بێ ئەوەی بتوانن هیچ ڕواڵەتێکی شەڕەکە بگۆڕن هەموویان کوژران، ئەڵەمانەکان چونکە –بەرلەوە– چەند شوێنێکیان بەڕێگای چەتربازی داگیرکردبوو، بەوە دەسخەڕۆبوونو ژمارەیەکی زۆر مرۆڤی موقەباو پلاستیکیان لەشێوەی مرۆڤ بەچەتر لەپشتی سەنگەرەکانەوە دابەزاند، بۆئەوەی خەڵکی شارەکە بخڵەتێنن، بەڵام هێزە بەرگریکارەکان[12] هەڵنەخڵەتان، لەیەکەم پەلاماردا بۆ سەر چەتربازەکان هەمویان کوشتن.

دوای ئەوە، ناوبەناو چەند جارێکی تر ئەڵەمانیەکان هێزی چەتربازیان لەپشت سەنگەرەکانەوە دابەزاند، بەڵام هێزە بەگریکارەکان دەمودەس لەسەریان ئامادەئەبوونو لەناویان ئەبردن.

[12] ئەو هێزە تێکەڵاوانە بوون کەلە هێزی بەرگری میللیو سەربازەکان پێکهاتبوون.

لەواقیعدا لەشەڕی (پۆڵەندە- لهستان) مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٣٩ -و لەشەڕی فەرەنسە- لەمانگەکانی مایس‌و حوزیرانی ساڵی ١٩٤٠و شەڕی دورگەی کرت ساڵی ١٩٤١، هێزە چەتربازەکانی ئەڵمان سودێکی زۆریان لەچەند پەلامارێکی کتوپڕ وەرگرت‌و توانیان بەو هۆیەوە هێزەکانی دوژمن لەناوبەرن، بەڵام ئەم تاقیکردنەوەیان بۆ گرتنی شارەکە، بۆ نەچووە سەر.

دوای ئەوەی کە لەئەڵمانیەکان تێگەیشتن ناتوانن بەرێگای هێزە چەتربازەکانیانەوە بچنە ناو شاری لینینگرادەوە، جارێکی تر باری تاکتیکی شەڕیان گۆڕی‌و بەتەواوی ئەڵقەی گەمارۆدانەکەیان توندکرد، بەو نیازە تاوەکو لەرێگای نەبونی خۆراک‌و ئابلۆقەی ئابوری‌و برسێتییەوە خەڵکی شارو هێزە بەرگریکارەکانیان لەناوبەرن.

تارۆژی ٢٥ی مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٤١، ئێستگەی رێگای ئاسنی (مگا)مان بەدەستەوەبوو، لەوێو بە رێگای ئاسندا هاتوچۆمان ئەکردو پەیوەندیمان لەگەڵ ناوچەکانی تری وڵاتدا هەبوو، بەڵام رۆژی ٢٥ی مانگی ئەیلول، ئەڵەمانەکان پەلاماریان بردە سەر ئێستگەکەو داگیریان کردو سەرجەمی پاسەوانەکانی ئێستگەکەشیان کوشت، لەوکاتەوە ئیتر بەتەواوی ئەڵقەی گەمارۆدانەکەی شار توندتربوو، ئیتر لەوکاتە بەدواوە توانامان نەما هیچ جۆرە خۆراکێك لەدیوی دەرەوەی خەندەکەکەوە بهێنین بۆ ناو شارو بەتەواوی هەموو جۆرە پەیوەندییەکی هاتوچۆکردنمان لەگەڵ دەرەوەدا پچڕا.

لیژنەیەك بۆ سەرژمێری ئازوخەی ناو شارو سەرپەشتیکردنی بەکارهێنانی رێك خرا، کە یەکێك لەئەندامەکانی ئەو لیژنەیە، فەرماندەی بەرگریی شارەکە بوو، ئەویتریان سەرۆکی شارەوانی بوو لەگەڵ چەند کەسێکی تر..

ئەم لیژنەیە پاش سەردانی سایلۆکان، بۆی دەرکەوت کە چوار ملیۆن کەس لەناو شاردا هەیە،و تەنیا شەش هەزار تەن گەنمیش لەسایلۆو هەمارەکانی دەوڵەتدا هەیە.. واتا ئەگەر هەریەك لەدانیشتوانی شار رۆژی نیو کیلۆ نان وەربگرن، ئەوکاتە بەشی تەنها (١٢) رۆژی خۆراکی خەڵکی شارەکە ئەکات.

ئەگەر زیاد لەو رادەیە گەنمو خۆراك لەشارەکەدا هەبایە، مەترسی برسێتی ئەوەندە نەئەبوو.. رەنگبێ هەندێك کەس لەماڵەوە هەندێك گەنم یان شەکرو چاو خۆراکی تریان هەبوبێ، بەڵام ئەوە بەئازوخەی شار دانەئەنرا.

**باری شەڕ لەهەموو بەرەکانی شەڕدا وەکو یەك خراپ بوو، ئەڵمانەکان زۆر بەگورجی سەرکەوتنیان بەدەست ئەهێنا. هەندێك لەو باوەڕەدابوون ئەڵمانەکان بەر لەتەواوبوونی زستان، هەموو شارەکانی تری وڵات داگیرئەکەنو لەلای خواروشەوە ئەگەنە روباری "ڤۆلگا".**

هەندێکی تریش لەو باوەڕەدابوون -کەهەر چۆن بێت- هەندێك لەشارە گەورەکان خۆیان رائەگرن، بەڵام زۆربەی خەڵك بەتەواوی لەو باوەڕەدابوون کە هەرگیز ئەڵمانەکان ناتوانن گەمارۆدانەکەی شاری لینینگراد بشکێنن، هەندێکیش تارادەیەك گەشبین بوون، ئەیانووت: لەم بەهارەدا کە بەفرو سەهۆڵەکان توانەوە، دەوڵەت شارەکەمان لەگەمارۆدانی دوژمن رزگار ئەکات.

لەو کاتەدا ژمارەی دانیشتوانی شار چوار ملیۆن کەس بوو، هەر بۆ ماوەی (٩) نۆ مانگ، شەش سەد هەزار تەن گەنمی پێویست بوو، تاکو دەوڵەت بتوانێ

ئەو گەمارۆدانە بشکێنن.. ئەگەر لەماوەی نۆ مانگدا هەر یەکێك لەدانیشتوان ڕۆژی نیو کیلۆ نانی پێ بدرابایە، ئەبوا (٥٤٠) هەزار تەن گەنم هەبایە، ئینجا بەشی ئەکرد.. لەهەمارەکانی دەوڵەتدا جگە لەو شەش هەزار تەن گەنمە، هیچ جۆرە دانەوێلەیەك یان شەکرو چا، یان هیچ جۆرە خۆراکێکی تر نە لەسایلۆکانی تر، نە لەسایلۆکانی دەوڵەتو نە لەبازاڕەکاندا نەبوو.

لەمانگی ئەیلول بەدواوە، جگە لەنانی وشکی هیچ جۆرە خواردەمەنیەکی تر نەما.. ئەگەر لەکاتی خۆیدا هەمان پەتاتەو ماشو نۆکو نیسکەی ناوچەکانی دەوروبەری شار کۆبکرابانەوەو بەرێکو پێکی دابەش بکرابایە، بەرگیری لەبرسامردنی سێ ملیۆن و شەش سەد هەزار کەسی خەڵکی شارەکە ئەکرد.. ئیتر بەوجۆرە نەئەبو کە لەسەر ژمارەی چوار ملیۆن کەس دانیشتوان سێ ملیۆن و نیویان لەسەرماناو لەبرسانا بمرن . گوناحی ئەمەش لەئەستۆی لێپرسراوانی ئەوسەردەمەی شاردا بوو، کە چارەنوسی ئەم خەڵکەیان دایەدەست سروشت .

دوای ئەوەی سەرژمێری هەموو ئازوخەی شارەکە کرا، بڕیاردرا هەر کەسێك ڕۆژی (١٥٠) سەدو پەنجا گرام نانی بدرێتێ. لەبەرئەوەی لەناو شاردا هیچ جۆرە خواردەمەنیەکی تر نەبوو، خەڵکی ناچاربوو بەو (١٥٠) گرام نانە، قەناعەت بکات.. تا ئەوکاتەی خەڵك بەهیوای ئەوەبوون خواردەمەنی تریان دەستبکەوێت، مەترسی ئەوەندەنەبوو. بەڵام کە دڵنیابوون ڕۆژی سەدو پەنجاگرام نان زیاتر هیچ خۆراکێك دەست ناکەوێت، ئینجا ترسان. تەنانەت ئەو کەسانەی لەبەر قەڵەوی دوچاری نەخۆشی فشاری خوێن ببون و تەنیا ڕێگای چاکبونەوەیان پارێزکردن و برسێتیبوو، ئەوەندە برسیان ببوو، هەموو

دوچاری نەخۆشی برسێتی بوونبوون .ئێمە ئەو کاتە نەمانئەزانی ئەو (١٥٠) گرام نانە ئەبێتە (١٠٠) گرام‌و ئینجا ئەبێتە حەفتاو پێنج‌و دواجار ئەبێتەپەنجا گرام، تا ئەوکاتەی بە یەکجاری نامێنێ.. ورده ورده دەنگوباس لەشاردا بڵاوبۆوە کە دەسەندەی رۆژانەی نان لەو رادەی ئێستا کەمتر ئەبێتەوە، خەڵک بە گورجی باوەڕیان بەم جۆرە هەواڵانە ئەکرد، لەبەرئەوەی زەمینەی باوەڕکردن بەکەمبوونەوەی دەسەندەی نان زۆر لەبار بوو، ڕۆژی دوایی دەسەندەی نانی رۆژانە بوو بە(١٠٠) گرام .. بۆئەوەی خەڵک ورە بەرنەدەن‌و خۆراگرین، لێپرسراوانی شار ئەوەیان راگەیاند کە لە دواڕۆژدا دەسەندەی نان لەم رادەی ئێستا کەمتر ئەبێتەوە .

ئەمە لەو کاتەدابوو کە یەکەمجار هەوری پایز بەری ئاسمانی گرت. لەوکاتەدا رۆژنامەکانی ناوشار بەردەوام بوون لەدەرچوون[1]، چونکە دەزگای کارەبا کاری ئەکردو رادیۆش هەبوو.. خەڵک بەهۆی رادیۆوە ئاگاداری هەموو هەواڵێکی ناو شارەکە ئەبوو، بەتایبەتی هەواڵی کەمبوونەوەی دەسەندەی نانی رۆژانە، کە لەهەموو شت زیاتر باسدەکراو ئەهەممیەتی ژیانی هەبوو. یان لە رۆژنامەکانا ئەیانخوێندەوە.. مەسەلەی کەمبوونەوەی دەسەندەی رۆژانەی نان، کارێکی زۆری کردە سەر گیانی خۆراگریانەی خەڵک .

لەو لەوباوەڕەدانیم تا ئەو رۆژە خەڵک دەستی بە خواردنی گۆشتی گیانلەبەرە حەرامەکان کردبێت، وەکو : کەرو سەگو پشیلەو.... بەڵام کە دەسەندەی نان بوو بە (١٠٠) گرام لە رۆژێکدا، خواردنی سەگو پشیلەو

---

[1] لەو کاتەدا بەهۆی باری شەڕەکەوە تەنیا دوو رۆژنامەی بچووك لە قەوارەی دەفتەری بەرباخەڵدا دەردەچوون.

گیانلەبەرە حەرامەکانی تر، شانپەشانی ئەو کەمبونەوەیە دەستی پێکرد. نەك زۆربەی خەڵك، بەڵکو تەواوی خەڵك بەزۆری هەر بێریان لە خواردن ئەکردەوە .

زۆر جار بیرم لە رابوردو کاتی ئاسایی ژیان ئەکردەوە، کە چۆن لە چێشتخانەی ماڵەوە کاتێك منالبوم دایکم چەندان جۆر خواردنی بۆ دائەنام‌و منیش بیانووم ئەگرت .. یان نەختێك گۆشت‌و پەتاتەو ماشم ئەخواردو ئەڕۆیشتم ..

**لەبیرم دێت زۆر جار دایکم گلەیی لای دراوسێکانمان ئەکرد، ئەیووت "ئاناتۆل" خواردنی پێ ناخورێت، ئەترسم لەم شت نەخواردنە دوچاری نەخۆشییەك بێت.**

ئاەو رۆژەی کارەبا ئیشی ئەکرد رادیۆ هەبوو، ئاگاداری هەواڵەکانی ناوخۆو دەرەوە بووین، رۆژنامە هەبوو، خەڵکی بەهۆی رادیۆو رۆژنامەوە لەهەواڵی شەڕ ئەگەیشتن‌و باسی شەڕیان بۆ یەکتر ئەگێڕایەوە. هەر لەو رۆژانەدا، بەهۆی نەبونی کەرەستەی سوتەمەنی، دەزگاکانی کارەبا لە کارکەوتن‌و کارەبا وەستا. رادیۆ لەکار کەوت، ئیتر رۆژنامە دەرنەچو، هیچ جۆرە هەواڵێکی شەڕمان لە هیچ لایەکەوە پێ نەگەیشت. ئەگەر ئێمە لەهەواڵی بەرەکانی تری شەڕ ئاگاداربوینایە، بەورادەیە نەئەترساین.. لەبەرئەوەی مرۆڤ هەرچەندە برسی بێت، ئەگەر ئاگاداری هەواڵی ناوخۆی، خۆی‌و دەرەوەو، وڵاتەکەی خۆی بێت ئەوەندە ورەی دائەبەزێ‌و ورەبەرنادات .

بۆ نمونە:

ئەگەر کارەبامان هەبایەو رادیۆ کاری بکردایە، هەواڵی ئەوەمان ئەزانی کاتێك ئەڵەمانیەکان پەلاماری وڵاتەکەیان دان، دەوڵەتی ئینگلیز بڕیاری‌داوە

لەرێگای زۆرووی ئەورووپاوە، ئازوخەو چەکو هەموو جۆرە مەکینەیەك بۆ ڕوسیا بنێرێت. لەرێگای بەندەری "مورمانسك"ەوە کە کەوتۆتە لای زۆرووی وڵاتەوە پێمان ئەگات، ئەگەر هەواڵی ئەوەمان بزانیایە کە یەکەمین کاروانی کەشتی ئینگلیزەکان لەزۆرووی ئەورووپاوە هاتووەو گەیشتۆتە بەندەری "مورمانسك"، ئێمەش خۆراگرترو ورە بەرزتر ئەبووینو هیوامان بەدوارۆژمان گەشتر ئەبوو.

ئێمە لەسەرەتای شەڕەکەدا ئەوەمان بیستبوو کەدەوڵەتی ئینگلیز یارمەتیمان ئەدات، بەڵام دەزگا ڕاگەیاندنەکانی خۆمان ئەوەند بەخراپ باسی دەوڵەتە سەرمایەدارەکانیان کردبوو، بڕوامان نەئەکرد دەوڵەتێکی سەرمایەداری وەکو ئینگلیز ڕاستمان لەگەڵدا بکاتو یارمەتیمان بدات.

ئەگەرچی لەیەکەمین جەنگی جیهانیدا، دەوڵەتەکانی فەرەنسەو بەریتانیا یارمەتی ڕوسیایان دا، بەڵام لەوکاتەدا ڕوسیا دەوڵەتێکی ئیمپەراتۆریو سەرمایەداری بوو، نەك وەکو ئێستا دەوڵەتێکی سۆشیالیستی.

**ئەوانەی خاوەنی تاقیکردنەوە بوون، ئەیانوت: "مەبەستی ئینگلیزەکان لەمەدا -گوایە یارمەتی ڕوسیا ئەدەن- تەنیا بۆ کات بردنە سەرە".**

بەوجۆرەی کە فەرەنسە لەماوەی چەند هەفتەیەکدا لەناوچو، ڕوسیەش هەر بەوجۆرە لەماوەیەکی کەمدا لەناوبچێتو دوایی بڵێین:

**"تاکو ئێمە کەلوپەلو ئازوخەو چەكو تەقەمەنیمان لەسەر کەشتیەکان بارکرد شەڕەکە تەواوبوو، چونکە ئەوانە وا ئەزانن**

**روسیا وەکو فەرەنسە وایە لەماوەی شەش هەفتەدا لەناوبچێت، ئیتر ئەوە نازانن کە خەڵکی ئێمە خەڵکێکی خاوەن تاقیکردنەوەو خۆراگرن".**

ئێمەش کەتاقیکردنەوەمان کەمبوو، ئەمان ئەزانی چۆن بیریکەینەوە، بەلام ئەگەر بمانزانیایە دەوڵەتی بەریتانیا کاروانی دەریایی بۆ بەندەری "مورمانسك" ناردووەو خەریکی داگرتنین.. هیوامان بەرزتر ئەبووە.

یەکێکی تر لەو رووداوە گرنگانەی کەئێمە ئاگادارنەبووین، ئەوەبوو دەوڵەتی ئەمەریکا تێکەڵاوی شەڕەکە بووبوو، دەوڵەتی ئەمەریکا لەمانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤١دا لەدوای پەلاماردانی بەندەری "پیرل هاربور" لەلایەن ژاپۆنەوە لەتۆقیانووسی ئارامداو نوقمکردنی چەندان کەشتی ئەمەریکایی لەو بەندەرەدا تێکەڵاوی شەڕەکە بوبوو.

ئێمە ئەمانزانی لەیەکەمین جەنگی جیهانیدا چوونی ئەمەریکا بۆ ناو شەڕەکە بووە بەهۆی بەخێرایی سەرکەوتنی بەرەی هاو کارەکان.. ئەگەر ئێمە بەو هەواڵەمان بزانیبایە، ئەمانزانی شەڕی نێوان ئەمەریکاو ژاپۆن بەمانا هاریکاریکردنە لەگەڵ ئێمەدا،و ئەم هاریکارییە دەورێکی کاریگەرانەی ئەبێت، لەبەرئەوەی ئەمەریکاو ئینگلیز هێزی دەریایی زۆریان هەبوو.

ئەمڕۆکە[١٥] من پیاوێکی ئیختیارمو چومەتە ساڵەوە، ئاگام لەباری چۆنێتی دەرەوە –واتا دەرەوەی وڵات– هەیە، ئەوە ئەزانم کەلەو کاتەدا دەوڵەتی

[١٥] کاتی نوسینی کتێبەکەیە. وا دەرئەکەوێ ماوەیەك دوای شەڕەکە ئەم کتێبە نوسراوەتەوە.

ئەمەریکاو ئینگیز هەرچەند هێزی دەریاییان زۆر بەهێزبوو، نەیانئەتوانی هێزەکانی خۆیان بگەیەننە دەریای "بالتیك" و شارەکەمان لەو گەمارۆدانە رزگاربکەن، چونکە شارەکەمان کەوتە کەناری دەریای "بالتیك" و رۆژهەلاتی دەریاکەوە.

بەلام لەوکاتەدا هەر بەبیستنی هەوالی چونە ناو شەڕی ئەمەریکاوە، هیوایەکی بەرزمان بە دوارۆژ پەیداکرد.

کاتێك، دەسەندەی نان گەیشتە (٧٥) حەفتاو پێنج گرام لەرۆژێکدا، سەرمای زستانی ١٩٤١یش دەستپێکرد، بەرلەوەی سەرما زۆربێت خەلکی شار هەموو دارو درەختەکانی نزیك شاریان سوتاندبوو، بەجۆرێك کە لەکاتی سەرماکەدا خەلك هیچ جۆرە سوتەمەنییەك نەبوو. خەلکی بەناچاریو لەبەر سەرما، دەستیان کرد بەسوتاندنی دەرگاو پەنجەرەو کەرەسەی تەختەی ناومال و.... لەوکاتەدا بەهۆی سەرماو برسێتییەوە خەلك ئەمردن[١٦].

بەرلەوەی هەموو هۆیەکانی رۆیشتنی لەناوبچن، شەقامەکانی ناو شار وەکو شەوی شەڕیان لێهاتبوون، بەلام لەژووری مالەکاندا کەم تا زۆرو لە هەندێك مالدا چرا دائەگیرسا.

لەزستانی سالەکانی ١٩٤١-١٩٤٢دا، هەموو مالەکانی شار بێ چرا کەوتن، ئەوانە بەتاریکی دائەنیشتن، ئەوانەی توانایان هەبوو لەمال ئەچونە دەرەوە بۆ ئەوەی دەسەندەی نانی رۆژانەیان وەربگرن، ئەوانەش کەتوانای چونە دەرەوەیان نەمابوو، لەجێگای خۆیان ئەمانەوە تا ئەوکاتەی لە برسانا ئەمردن.

---

[١٦] کاتی سەرمقای وەرزی، مردنی خەلکە لەبەر سەرماو برسێتی..

هەمو دوکان‌و کارخانەو فابریقەو دەزگاو دامەزراوەکانی دەوڵەت داخرابوون، چونکە برسێتی ماوەی ئەوەی نەئەدا کەسێك بتوانێت بە کارێکەوە خەریك بێت‌و کارێك بکات.

هەرکەس لەشار بۆ خۆی ئەژیاو هەوڵی ئەوەی ئەدا لەسەرماو برسێتیدا نەمرێت، سەر شەقامەکان خامۆش بوون، شوێنە گشتییەکان بێ ناز بوون، ئەو کەسانەی لەسەر ڕۆخی شەقامەکان لەسەرما یان لە برسانا ئەمردن، کەسێك بەهاناو هاواریانەوە نەئەچو.. هەرکەس لە دانیشتوانی شار دوو ئەرکی گەورەی لەئەستۆدابوو، یەکەم خۆی بەخێو بکات‌و دووەم شانبەشانی ئەو خۆبەخێوکردنەش، ئەرکی نیشتمانی‌و پاراستنی شارەکە بەڕێوەبیات.

زۆربەی ئەو کەسانەی لەژوورەکانا ئەمردن، ژن یان پیاو، هەریەکە لەسەر پارچە کاغەزێك شتێکیان ئەنوسی بۆئەوەی دوارۆژ یان نەوەی داهاتویان لێیان تێبگەن.

هەرکەس لەماڵ ئەهاتە دەرەوە، حەزی ئەکرد بمرێت‌و ئیتر نەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، خەڵکی حەزیان ئەکرد لەدەرەوە لەبەر ڕووناکیدا بمرن، نەك لەژوورەوە لەبەر تاریکیدا بژین.. ژیان ئەو بەها پیرۆزەی نەمابوو کەمرۆڤ بۆی تێبکۆشێ..

شەقامەکانی شار لەزستانی ١٩٤١–١٩٤٢دا، مردوورێژ کرابوون، لە١٥ ڕۆژی یەکەمی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٠٢دا، هەر ڕۆژەی پانزە هەزار کەس‌و لەپانزە ڕۆژی دووەمدا، هەر ڕۆژەی ) سی هەزار کەس لەبەر سەرماو برسێتی‌و نەخۆشی ئەمردن.

لاشەی ئەو سی هەزارەی ئەمڕۆکە لەدەرەوەی ماڵەکان و لەسەر شەقامەکان ئەمردن، هەروەکو خۆیان ئەمانەوەو ڕۆژی دواتر، واتا بۆ سبەینێ، (٣٠) سی هەزاری تر ئەمردن بەسەریانا.

لاشەی مردووەکان وەکو پەڵەیەکی ڕەش لەسەر ڕۆخی شەقامەکان ئەمانەوە.. تاکو بەفر ئەباریو دایئەپۆشین.. دوای ئەوە چینێکی تر سەرلەنوێ لەسەر بەفرەکە ئەمرد. هیچ کەس بیری لەوە نەئەکردەوە لاشەی مردووەکان کۆبکاتەوەو بیانباتە دەرەوەی شارو بیانشارێتەوە، چونکە کەس توانای ئەمکارەی نەبوو.

هیچ کەس بیری لەوە نەئەکردەوە کە بەهار هاتو هەوا گەرمی کرد، بەفرو سەهۆڵەکان توانەوە، ئەم سەدان هەزار لاشەی مردووە -بگرە زیاتریش- چۆن بۆگەن ئەکەنو ئەبنە هۆی بڵاوبوونەوەی هەزاران جۆر نەخۆشی، لەبەرئەوەی کەس هیوای ئەوەی نەمابوو تاکو بەهار دێت بژیو لەسەرماو لەبرسانا نەمرێ.

**ڕوداوێکی سەیر:**

**ڕۆژێك بەسەر شەقامێکدا ئەڕۆیشتم، دووکابرای بەساڵاچووی ئێختیارم دی لە کەناری شەقامەکە دانیشتبوون، هەریەکەیان بەچەقۆیەك خەریکی برینی قاچی ئەویتریان بوو، چونکە هەردوکیان سەرما بردبوونی[*] لەبەرئەوەی هیوایان بەدکتۆرو دەواو دەرمان نەمابوو -چونکە نەبوون- ئەیانویست بەم هۆیەوە چەند ڕۆژێکی تر بژین.**

---

[*] سەرما بردە بە زستانی ساردا ئەبێت کە سەرماکە کار ئەکاتە سەر کەمکردنەوەی تەوژمی خوێنو کوشتنی شانەکانی لەش..

بەلام خەلکی کەدەستو قاچیان سەرما ئەیبرد ئەیان ئەبڕی، چونکە ئەیانزانی بڕینی دەستو قاچیان، لەمردن رزگاریان ناکات.. ئەوانیش ئەیانویست بمرنو لەو ژیانە مەینەتاوییە رزگاریان بێت.

**دیمەنێکی ناخۆش:**

**شوێنێک کەوەکو کوشتارگا وابوو، مرۆڤ سڵی لێ ئەکردەوە بەردەم نانەواخانەیەک بوو، رۆژانە خەڵک بۆ وەرگرتنی دەسەندەی رۆژانەی نانی خۆیان، چەند سەعاتێک لەو بەرسەرمایەدا ئەوەستانو لەناکاو ئەکەوتن بەسەر یەکتردا و ئەمردن...**

ئەوانەی لەبەردەم ئەونانەواخانەیەدا ئەکەوتنو لەبرسانا ئەمردن هەر لەوێدا ئەمانەوە، بۆ سبەینێ خەڵکی لاشەکانیان پێ کوت ئەکردن.

**پیلانێکی ژەهراوی:**

رۆژێک دەستەیەک فرۆکەی ئەڵمانیەکان بەئاسمانی شاردا تێپەڕینو نانی سپییان بەردایەوە، خەلکی بە پرتاو رایان ئەکردو ئەیانخواردن، ئەمەش بوو بەهۆی کوشتنی خەلکێکی زۆر لەدانیشتوانی شار، چونکە نانەکان هەموویان ژەهراوی بوون. هەروەکو بڵێی سەرماو برسێتی بۆ کوشتنی خەلکی شارەکە کەم بوو، ئەوانیش نانی ژەهراویان بۆ بەرئەدایەوە.

**پیلانێکی تر:**

رۆژێکی تر دیسان ئەڵمانیەکان جگە لەنانی سپی، پاکەتی شیرینیو شوشە ئاوی میوەو پسکیتو خواردنی تریان بەرئەدایە خوارەوە؛ سەرباری ئەوەی

خەلکی هەوالی نانە ژەهراوییەکانیان بیستبوو، کەچی لەبەر برسێتی‌و ناچاری لەو نان‌و شیرینی‌و ئاوی میوەیانە ئەخواردو ئەوانیش وەکو دەستەی پێش خۆیان ئەمردن، زۆر کەسیش بەتایبەتی ئەو خۆراکە ژاراویانەیان ئەخوارد، هەر بۆ ئەوەی بمرن‌و لەو ژیانە ناخۆشە رزگاربن...

**نەمانزانی هۆی چی بوو دوژمن ئیتر وازی لە بەردانەوەی نانی ژەهراوی‌و ئەمجۆرە شتانە هێنا...**

پلەی سەرمای ئەو زستانە گەیشتە پەنجا پلە لەژێر سفرەوە[18]، رادەی لەبرساو لەسەرما مردووەکان گەیشتە رۆژەیەک لەهەر هەشت کەس حەوتیان مردن، لەم رووەوە سەرژمێرییەک نەکراوە تاکو بزانین چەند کەس لەژوورا مردوون‌و چەندەش لەسەر شەقامەکان، بەلام وەکو دەرکەوتووە، نزیکی ٧٠٠-٨٠٠ هەزار کەس بەتایبەتی منالان، لەناو خانوەکانا مردوون.

پێویست بە باسکردن ناکات کە ناخۆشترین مردن مردنی منالەکان بوو، چونکە نەیانئەزانی لە کوێوە هاتوون‌و بۆ کوێ ئەچن.

**منالەکان لە برسانا ئەگریان‌و لە سەرمانا ئەلەرزین، ئەنجام لە باوەشی دایکیانا بەبێ ناز ئەمردن.**

لەو کاتەدا دەسەندەی نان لە ٧٥ گرام لەرۆژێکدا بوو بە ٥٠ گرام.. بەلام نانەکە زۆر باش بوو، چونکە هیچ شتێکی تر نەبو تێکەل بەئاردەکە بکرێ‌و ئاردەکە خراپ بکات.

[18] لەهەندێک کاتا لەو رادەیەش زیاتری ئەکرد.

لەدووەمین جەنگی جیهانیدا، تارادەیەکو زۆربەی شارەکانی ئەوروپا دوچاری کەمی ئازوخە بووبوون،و لەزۆربەی شارەکانیشدا بازاڕی ڕەش بۆ فرۆشتنی ئازوخە پێکهات.

هەرکەس پارەی هەبایە ئەیتوانی ئەوەندەی بیەوێ ئازوخەو شتومەکی خواردەمەنی بۆ خۆی بکڕێ.

بەڵام لینینگراد، لەسەرەتای شەڕەکەدا نەبێت بازاڕی ڕەشی تیا نەبوو، ئەمەش لەبەرئەوەبوو کە هیچ شتێکی تیا نەبوو تاکو لەبازاڕی ڕەشدا بیفرۆشن.

**شاری ستالینگرادیش لەلای خوارووی ڕوسیەوە لەکەنار ڕوباری "ڤۆلگا"، بەهۆی شەڕەوە وێران بووبوو، بەڵام کەسێکی تیا لەبرسانا نەمرد.**

کاتێك دەسەندەی ڕۆژانەی نان گەیشتە ڕۆژی ٥٠ گرام، خەڵکی ناچاربوون لەبەر برسێتی دەستیانکرد بەخواردنی گۆشتی مردووەکان، لە ... ی ریستۆرانتەکانا بەئاشکرا کەوتنە مردوو خواردن، کە ئەتوانین ئەم ریستۆرانتانە، بەبازاڕی ڕەشی ئەوکاتەی لینینگراد دابنێین.

چومە[١٩] یەکێك لەو رستۆرانتانەو بۆ یەکەمجار گۆشتی مردووم خوارد، لەوە بەدواوە هەموو جار بۆ خواردنی گۆشتی مردوو، ئەڕۆیشتمەوە بۆ هەمان رستۆرانت.

دەوڵەت زۆر بەباشی ئاگاداری ئەو رستۆرانتە بوو کە گۆشتی مردوی تیا ئەخورا، بەڵام هێشتا بەرەسمی لەلایەن دەوڵەتەوە ڕێگا نەدرابوو، چونکە

[١٩] نوسەری کتێبەکەیە.

هێشتا دەوڵەت ڕۆژی پەنجا گرام نانی بەهەر یەکێك لەو خەڵکە ئەدا، ئەوەندەی پێ نەچوو ڕۆژێك دەرگای هەموو نانەواخانەکان داخران و ئەو ڕۆژی پەنجا گرامەش نەما.

تا ئەو ڕۆژەی دەوڵەت ڕۆژی پەنجا گرام نانی بەهەر یەکێك لە خەڵکەکە ئەدا، ڕوخساری کۆمەڵگایەکی شارستانی بەشارەکەوە دیاربوو، چونکە تا ئەوکاتە خەڵك هیوای بەژیان مابوو، هەموو ڕۆژ دەسەندەی پەنجا گرامی نانی خۆیان وەرئەگرت، بەڵام کە ئەو ڕۆژی پەنجا گرامە نەما، ئیتر پەیوەندیی نێوان خەڵك و ژیان پچڕا و خەڵك هیچ هیوایەکی بەژیان نەما.

کاتێک دەسەندەی نان بڕا، دەوڵەت هیچ ئاگادارییەکی لەم ڕووەوە بڵاونەکردەوە،و بەهیچ جۆرێکیش باسی لەهۆکاری بڕینی دەسەندەی نانی ڕۆژانە نەکرد، ئەمەش بەزۆری لەبەرئەوەبوو کە نە ڕۆژنامە هەبوو نەدەزگای رادیۆ.. بەڵام خەڵک زۆر باش ئەیانزانی بۆیە دەسەندەی ڕۆژانەی نان بڕاوە، چونکە ئازوخە لەشارەکەدا نەماوە.

بەرلەوەی دەسەندەی ڕۆژانەی نان بڕێت، من دەستم کردبوو بە خواردنی گۆشتی مردووەکان، لەبەرئەوە دەسەندەی نان منی لەبرسێتی ڕزگارنەکرد، لەکاتی بڕینی ناندا ژەهری "پتومایین"[1] وای لێکردبووم کەهیچ ئاگایەکم لەخۆم نەمابوو، چاوم بەدوکانی نانەواکان ئەکەوت هەموویان داخرابوون، بەخۆم ئەوت:

"خۆم بۆ مەرگ ئامادەبکەم". لەو باوەڕەدابووم تێکڕای خەڵک هەموو وەکو من بیریان ئەکردەوە.

[1] پتومایین.. جۆرە ژەهرێکە لە ناو گۆشتی مردوودایە.. هەرکەس ئەو گۆشتە بخوات دوچاری ئەو ژەهرە ئەبێت.

**دوای برینی دەسەندەی نان، دەوڵەت رێگای لە خواردنی گۆشتی مردوو نەگرت، چونکە جگە لەلاشەی مردووەکان هیچ شتێکی تر نەبوو تاکو خەڵک بیخوات..**

بەداخەوە کاتێک نان برا، سوتەمەنیش لەناو شارەکەدا تەوابوو، ئینجا خەڵك ناچاربوون لەبەر برسێتی گۆشتی مردوویان بەکاڵی ئەخوارد.

بەهۆی ئەوەوە کە لەدەرگای رۆژنامەنووسیدا کام ئەکرد، کتێبخانەیەکی گەوەی پڕ لەکتێب و گۆڤارو رۆژنامە کۆنم هەبوو، زۆر جار بۆ گشت برژاندن لێم ئەسوتاندن، شەوانەش لەسەرماناا بەسەرو قاچمەوە ئەپێچان.

ئەڵمانیەکان، لەدوای تەوابوونی دەسەندەی رۆژانەی نان، چەند شەوو رۆژێك یەك لەسەر یەك شارەکەیان دایە بەر گوللە تۆپ، بەو نیازەی شارەکە هەمووی وێران بکەن.

**رووداوێکی سەیر:**

رۆژێك بۆ هێنانی گۆشتی مردوو لەژوورەکەم چومە درەوە، دەرگای ماڵی یەکێکم لەهاورێکانم دی کرابۆوەو جوتێك چەکمەش بەحەواوە لەناو ژوورەکەدا هەڵواسرابوو، کە چومە ژوورەوە تەماشام کرد خاوەن ماڵەکە بەپەتێك هەڵواسراوەو لاقێکی لێ کراوەتەوە.. زۆر سەرم سوڕما، بۆ ئەبێت ئەو کەسەی قاچی ئەم کابرایەی بڕیوە ئەوەندە ئەرکی کێشاوە، لەو پێپلیکانانە سەرکەوتووەو ئەم پیاوەی هەڵواسیوەو قاچەکەی بڕیوەتەوە.. خۆ هەر لەسەر شەقامەکە گۆشتی لەمە باشترو زۆرتر هەبوو بیبردبایە.

پەیتا پەیتا بەگەرمی دەنگی گوللە لەتۆپی ئەڵەمانیەکان ئەهات کە بەسەر شارەکەدا ئەڕۆیشتن و ئەتەقینەوە، دەنگی ڕوخاندنی خانوبەرەو دوکان و شوێنە نیشتەجێکان ئەهاتن؛ بەڵام کەسێك لەدەنگی گوللە تۆپ یان فڕۆکە نەئەترسا، چونکە لەگەڵ مەترسی یەکی گەورەتردا ڕوبەڕووبوونەوە، کە ئەویش سەرماو برسێتی بوو..

هەروەها، لەبەرئەوەی هیچ هۆیەکی گواستنەوەو هاتوچۆکردن لەشارەکدا نەمابوو، خەڵك بەگشتی بەناوەڕاستی شەقامەکاندا هاتوچۆیان ئەکردو ئەکەوتن بەزەویدا..

بەهۆی ئەوەی هەندێك کاغەزی کۆن و کۆنە ڕۆژنامەو کتێب و گۆڤارم هەبوو، ئەو هاوڕێیانەم کەئەیانناسیم بەتایبەتی ئەهاتن بۆ لام بۆ ئەوەی گۆشتی مردوو بەکاغەزەکان ببرژێنن.

لەسەرەتاوە خەڵك شەرمی لە خواردنی گۆشتی مردووەکان ئەکردو زاتیان نەئەکرد ئاشکراو لەبەرچاو خەڵکی تردا ئەمکارە بکەن.. دیسانەوە بەپێی یاساش ئەمکارە کارێکی ناپەسەندانە بوو.. بەڵام برسێتی و باری ناچاری کارێکی وایکرد خەڵکەکە دەقیان پێوە گرتو لەبەرچاو یەکتریدا لاشەی مردووەکانیان لەتوپەت ئەکرد. کاتێك سەیری شەقامەکانت ئەکرد، ژن و پیاو بەچەقۆی گەورەو تیژەوە لاشەی مردووەکان ئەمدیو ئەودیو ئەکەن و بەشوێن گۆشتی مردووی قەڵەودا ئەگەڕێن و لەتو پەتیان ئەکەن و ئەیانبن.

هاوڕێیەکەم ڕۆژێك وتی:

"هەروەکو چۆن هاوین ئەو هەمو پەتاتەیەمان بەخەسار ڕشت‌و لەناومان بردن، ئێستاش ئەم هەموو گۆشتە بەبێ دەست پێوەگرتن ئەخورێ‌و لەناوئەچێ، ڕۆژێك دێت بۆی پەشیمان ئەبینەوە".

منیش بیرم لەوە ئەکردەوە

"لەبەر نەبوونی کارەبا یەخچاڵەکان کارناکەن تاکو گۆشتیان تیا هەڵبگیرێ.. ئەگەر بەوجۆرەش بە گورجی نەخورێت، چەند ڕۆژێکی تر کە بەهار هات‌و هەوا گەرم بوو، هەموویان بۆگەن ئەکەن‌و هەزاران جۆر نەخۆشیان لێئەکەوێتەوە".

بەشێکی زۆری خەڵکی شار بیریان لەم مەسەلەیە کردبووە، بۆیە زۆربەیان کەوتنە خۆ لەژێر خانە ساردەکانا چاڵیان هەڵئەکەندو لاشەی مردووەکانیان تیائەشاردەوەو پاشەکەوتیان ئەخستن بۆ ئەو کاتەی کە هەوا گەرم ئەکات‌و گۆشتی سەرشەقام‌و کۆڵانەکان بۆگەن ئەکەن.

کەگۆشتی مردوو خواردن بوو بەشتێکی ئاسایی، ئیتر ئەوەندە خەڵك لەبرسانا نەئەمردن، هەواش بەرەو خۆشی ئەچوو، لەو شارە گەورەیەدا تەنیا نەخۆشخانەیەك نەمابوو، ئەڵمانیەکان هەموویان بەبۆمباو گوللە تۆپ وێران کردبوو.

خەڵکی ناو شار نەخۆشەکانیان لە باڵەخانەیەکی گەورەی چەند نهۆمدا کۆئەکردەوە، بەڵام لەبەرئەوەی خۆراك نەبوو بیاندرێتێ، بەبێ خواردەمەنی ئەمانەوە، خواردنی خەڵك بریتی بوو لەگۆشتی مردوو، لەوکاتەدا هێشتا دەوڵەت دانی بەخواردنی گۆشتی مردودا نەنابوو، لەبەرئەوە کەسێك گۆشتی مردووی بەنەخۆشەکان نەئەداو هەر لەجێگای خۆیان زیاتر لەبرسانا ئەمردن.

## هاتنی فڕۆکەکان:

ڕۆژێک لەناکاو گوێمان لەدەنگی فڕۆکە دوپەروانەکانی خۆمان[٢] بوو، هەرچەند سەیرمان کرد لەبەر زۆری و نزمی هەورەکە هیچمان بەرچاونەکەوت.

هەرلەو ڕۆژنەدا، بیستمان کە فڕۆکەکانی خۆمان[٣] چەند کیسەیەک خواردەمەنییان خستۆتە خوارەوە، بەلام لەبەرئەوەی هیچ هۆیەکی پەیوەندیکردن نەبوو لەگەڵ فڕۆکەکانا، نەمانزانی لەکوێیان داخستووە.

ڕۆژی دوایی دیسان بەهەمان شێوە گوێمان لەدەنگی چەند فڕۆکەیەکی تری خۆمان[٤] بوو، زانیمان کە دەوڵەت لەپەیجۆری ڕزگارکردنی شارەکەدایە، بەلام ئایا بەهۆی چەترەوە چۆن ئەوەندە ئازوخە ئەگات کەبەشی هەموو خەلکی شارەکە بکات.

ڕۆژی ٢٩ی مانگی ساڵی ١٩٤٢بوو، کەدیسان کۆمەڵێکیتر فڕۆکەی خۆمان[٥] هاتنە سەر شارەکەو چەند بەیاننامەیەکیان فڕێدایە خوارەوە، خەلکی بەپرتاو رایان ئەکردو بەپەلە بەیاننامەکەیان ئەخوێندەوە، لەبەیاننامەکەدا نوسرابوو:

**"دەوڵەت ئاگاداری باری برسێتی شارەکەیە، بەلام لەبەر تەوژمی هەواو توندوتیژی شەڕی ئەڵقەی گەمارۆدانەکە، ناتوانێت بەئاسانی ئازوخە بۆ شارەکە بەرداتەوە، بەلام بەپێی توانا هەوڵئەدات ئازوخە بۆ شارەکە بنێری".**

[٢] و [٣] و [٤] و [٥]، بەمانا دەوڵەت ئەگرێتەوە.

پاش ئەو ماوە دوورو درێژە کە خەڵک بەهۆی نەبوونی ڕۆژنامەو رادیۆوە ئاگای لەدەرەوەی شار نەمابو،و بۆ یەکەمین جار هەواڵی دەرەوەیان بیستو ئاگاداربوون.

بەلام هێشتا ئەوە نەزانرا کە ژاپۆن لەدژی ئەمەریکاو ئینگلیز تێکەڵاوی شەڕەکە بووەو ئەمەریکاش چۆتە ناو شەڕەکەوە.

تا ئەوکاتە سێ مانگ بەسەر شەڕی نێوان ژاپۆن‌و ئەمەریکادا تێپەڕیبوو، کەچی ئێمە هیچ ئاگایەکمان لەمەسەلەکە نەبوو، دەوڵەت نەیئەزانی ئێمە بەوجۆرە لەوەزعی دەرەوە بێ ئاگاین.

**خەڵکەکە ئەوەندە برسی‌و بێ هیوابوون، هیچ دڵیان بەو بەیانانامانە خۆش نەئەبوو.**

لەسێیەمین ڕۆژی مانگی نیسانی ساڵی ١٩٤٢دا پۆلێک فڕۆکەی تر ئاژوخەیان هێنابوو، کەچی لەئاسمانی شاردا، بەرلەوەی بارەکانیان بخەنە خوارەوە، لەگەڵ چەند فڕۆکەیەکی جەنگی ئەڵەمانیەکانا دایان لەیەکو کەوتنە شەڕەوە. فڕۆکە روسییەکان توانایان بەسەر فڕۆکە ئەڵەمانیەکانا نەئەشکا، ناچار رایانکرد.

ژەهری "پتۆمایین" کەلە ناو گۆشتی مردوەکانا بوو، زۆربەی ژن‌و پیاوی شارەکەی گێژکردبوو، خەڵکەکە بێ هەست بەخۆکردن بەسەر شەقامەکانا ئەڕۆیشتن.

هیچ پێویست بەوە ناکات باسی پیسی شەقام‌و کۆڵانەکان بکەم، خوێنەر خۆی ئەزانێت شارێکی قەرەباڵغ‌و بێ ئاوو کارەباو بێ دەستشۆرو ئاودەست‌و بێ گەرماو بێ هۆیەکانی تری تەندروستی‌و بێ نان، ئەبێ چۆن بووبێت.

شەقام و کۆڵانەکان هەموویان بوون بەشوێنی خۆشوخاڵ و... ئەو شارەی کە هەمیشە وەکو بووک رازابۆوەو بەخاوێنترین شاری جیهانی ناسرابوو، بوو بەپیسترین و بۆگەنترین شاری جیهان.

خەڵکی شار هەموو ریشیان هاتبوو، کەسێك تاقەتی ریش تاشینی نەمابوو، هیچ شتێکی سروشتی کۆمەڵایەتی وەکو خۆی نەمابۆوە. روخسارو شارو خەڵکی شار بەتەواوی گۆڕابوو.

خواردنی گۆشتی مردوو بەجۆرێك خەڵکی گێژکردبوو، کە دایك تەنانەت شیری بەمناڵی بەر مەمکانەی خۆی نەئەداو مناڵەکان لەبرسانا ئەمردن.

هەر مناڵێك ئەمرد، چەند رۆژێك لەناو ژوورەکانا ئەمانەوە، کە بۆگەنیان ئەکرد، ئینجا دایکەکان مناڵەکانیان لەپەنجەرەکانەوە فرێئەدایە سەرشەقام و ناو کۆڵانەکان.

لەنیوەی مانگی نیسانی هەمان ساڵ بەدواوە، کەشوهەوا بەرەو گەرمی ئەرۆیشت و بەفرو سەهۆڵەکان بەرەبەرە ئەتوانەوە، رۆژێك ئافرەتێکم دی لەسەر رۆخی شەقامەکە دانیشتبوو، مناڵێکی کۆرپەی بەباوەشەوە بوو، بەبێ هەستکردن ئەیخست بەملاو بەولادا، تاکو لەناکاو وەکو پارچە خۆشوخاڵێك فرێیدایە سەر زەوی، بەگورجی زانیم ئەو ئافرەتە هیچ هۆشی لای خۆی نەماوەو بەرپرس نییە بەرامبەر بەهیچ کردارێکی خۆی و هەموو شارستانێتییەکی رابوردووی لەبیرچۆتەوە.

لەرۆژانی چوارەم و پێنجەم و شەشەمی مانگی نیساندا، دیسان فڕۆکەکان دەرکەوتنەوە، هەندێك بەیاننامەیان بەسەر شارەکەدا بەردایەوە، کاتێك بەیاننامەکان خوێندرانەوە، دەوڵەت داوای لەخەڵکی شارەکە کردبوو:

**"لەبەرئەوەی فرۆکەخانەکە لەدەرەوەی شارەو ئەڵمانیەکان دەستیان بەسەرداگرتووە، پێویستە خۆتان[1] شوێنێک بۆ فرۆکەخانە لەناو شاردا پاك بکەنەوە، تاکو فرۆکەکان تیایا بنیشنەوەو ئازوخەتان بۆ بێنن".**

دوای ئەوە هەوا نەختێك گەرم بوو، شارەکە بەتەواوی بۆگەنی کرد چونکە زیاتر لەسێ ملیۆن مردوو لەسەر شەقام و کۆڵان و ناو خانووەکانا کەوتبوون.

ئەو ئازوخەیەی فرۆکەکان بەریان ئەدایەوە، بەشی ژیان وگوزەرانی خەڵکی شاری نەئەکرد، چونکە هەندێك لەو ئازوخەیە لەبەرەگای شەڕو لەسەر سەنگەری ئەڵمانییەکان ئەکەوتنە خوارەوەو بەقسمەت نەئەبوون.

ڕێگای چارەسەرکردنی هێنانی ئازوخە بۆ ناوشار هەر ئەوەبوو لەناو شاردا فرۆکەخانەیەك دروست بکرێ، تاکو فرۆکەکان بەئاسانی بتوانن تیایا بنیشنەوە، خەڵکەکە ناچاربوون تا ئەوکاتەی لەڕێگای ئاسمانییەوە ئەوەندە ئازوخەیان بۆ دێت بەشی ژیانیان بکات، بەناچاری هەر گۆشتی مردووەکان بخۆن.

هەتا هەوا گەرمتر بوایە بۆگەنی لاشەی مردووەکان زۆرتر ئەبوو، تا ئەو رادەی لێهات لەبەر بۆگەنی لاشەی مردووەکان، هیچ کەس هۆشی لەسەر خۆی نەمابوو.

کاتێکیش بەفرو سەهۆڵەکان توانەوە، شەقام و کۆڵانەکان هەر یەکە وەکو نیمچە ڕووبارێکیان لێهات کە پڕبێ لەخۆڵ و خاڵ و لاشەی مردوو.

[1] خۆتان – مەبەست لە خەڵکی شارەکەیە -وەرگێر-

هەرچەند بیر لەوە ئەکەمەوە چۆن ئێمە[1]، توانیمان ئەو هەموو لاشەی مردووانە دووربخەینەوەو شارەکە پاکبکەینەوە، وەکو ئەرکێکی لەڕادەبەدەر دێتە بەرچاوم.

ئەوەی کە وورەی بەرزکردبووینەوەو پاڵی پێوە ئەنا بۆ شارەکەمان پاکبکەینەوەو زیاتر خۆڕاگرین، هەستی نیشتمانپەروەریی و خۆشەویستی شارو نیشتمانەکەمان بوو لەدڵی هەریەک لەدانیشتوانی شاردا. ئێمە بەو خۆڕاگرییە توانیمان نەخشەی دوژمن وەکو نەخشی سەر ئاو لێبکەین، کە ئەیویست شارەکەمان داگیربکات.

---

[1] دانیشتوانی شارەکە.

رۆژێک چەند فرۆکەیـ ـی دەوڵەت لـەناو شاردا لـەو شوێنەی کە کرابووە فرۆکەخانە نیشتنەوە، لەهەموو ژمارەی چوار ملیۆن کەس لەدانیشتوانی شار، تەنیا نزیکەی پێنج سەد هەزار کەس لەشارەکەدا مابوونەوە.

## پاککردنەوەی شار:

کاتێک بڕیاردرا لاشەی مردووەکان دووربخرێنەوە، لەهەموو لایەکەوە ئەو پرسیارانە هاتنە پێشەوە کە چۆن لایانبەرین و بەچی لایانبەرین و بۆ کوێیان بەرین؟ ئێمە نەمانئەتوانی بەهۆی مەکینەی گڵ هەڵکەندنەوە چاڵیان بۆ هەڵکەنین و بیان نێژین، چونکە لەبەر نەبوونی سوتەمەنی مەکینەکان ئیشیان نەئەکرد.

ئەگەر بمانویستبایە بەپاچ و بێڵ چاڵیان بۆ هەڵکەنین، دیسان لەبەر زۆری لاشەکان و سەختی زەوی کە سەرمای زستان بەستبووی، بۆمان هەڵنەئەکەندرا.

بڕیاردرا لاشەکان هەموو فڕێ بدرێنە خەندەکە گەورەکەی دەوری شار و بۆ ئەوەش کە خەندەکەکە پڕنەبێتەوە، لەهەموو شوێنەکانی خەندەکەکەدا لاشەکان کۆمەڵ کۆمەڵ دابنرێن و گڵیان بەسەردا بکرێ.

لـەناو شـاردا هـیچ هۆیـەک بـۆ گواسـتنەوەی لاشـەی مردووەکـان و دوورخستنەوەیان لەناو شاردا نەبوو، چونکە لەبەر نەبوونی سوتەمەنی هیچ ئۆتۆمبێلێک کاری نەئەکرد و ئەسپ و هێستری چوار چەرخەکانیش[1] نەمابوون تاکو چوار چەرخەکانیان پێ رابکێشین.

---

[1] عارەبانەی ئەسپدار.

لەپێچکەی ئوتۆمبێلی کۆن و چوار چەرخەی بێ ئەسپ و تەختەو دارو ئەمجۆرە شتانە، چەندان چوار چەرخی دەستیمان دروستکردو دەستمانکرد بەگواستنەوەی لاشەی مردووەکان بۆ ناو خەندەکەکەو دوورخستنەوەیان لەشار.

ئەوەندە بۆگەنی لاشەکان زۆر بوو، زۆرجار پیاوو ژنە ئیشکەرەکان –واتا ئەو پیاوو ژنانەی مردووەکانیان بەچوار چەرخە ئەگواستەوە بۆ دەرەوەی شار– لەکاتی بەرزکردنەوەی لاشەی مردووەکانا، لەبەر بۆ گەنی مردووەکان ئەبورانەوەو لەسەر خۆیان ئەچوون.

هەرچوار چەرخەیەک بەپێنج شەش کەس رائەکێشرا، لەیەکەمین رۆژی کۆکردنەوەی لاشەی مردووەکانا ئەوە دەرکەوت کە پێویستەو ئەبێت لەپێشدا ئەو لاشانە دووربخرێنەوە کە سەر شەقامە گەورەکانیان گرتووە، بۆ ئەوەی رێگای هاتوچۆی چوار چەرخەکان و گواستنەوەی لاشە مردووەکانی تر چۆڵ بکەن.

دوای ئەوەی شەقامە گەورەکان پاککرانەوە، ئینجا دەستکرا بە پاککرنەوەی شەقامە بچوکەکانی ناو شارو کۆڵان و ناو خانوو باڵەخانەو ژێر زەمینەکان، ژن و پیاو پێکەوە هەموو خەریکی ئەمکارە بوون، بەجۆرێک بۆنی مردووەکان کاری کردبووە مێشکی خەڵکەوە، تەنانەت دوای چەند مانگێک –بگرە زیاتریش– هێشتا بۆنی لاشەی مردووەکان لە مێشکی خەڵکی شاردا مابووەوە.

**لەو رۆژەوە کە دەسەندەی نانی رۆژانە نەما، تا ئەو رۆژەی شەڕ کۆتایی پێهات، سەرلەنوێ ژیان گەرایەوە بۆ ناو شارو نان دابەشکرایەوە، گوێم لەدەنگی یەکێک نەبوو لەناو شاردا گۆرانی بڵێت.**

لـەکاتی پاککردنـەوەی شـاردا، لاشـەکانمان بەچـوار چـەرخە ئـەبردو ئەمانخستنە نـاو خەندەکەکـەوەو ئـەختێك گڵمـان ئـەکرد بەسـەریاندلو دامـان ئەپۆشین.. تاکو بۆگەنیان نەیەت.

کاتێك لاشەی مردووەکانمان بەرزئەکردەوە، زۆرجار وا رێئەکـەوت لاشـەی هاوڕێیەکی خۆمم ئەدی، هیچ دڵم دانەئەچڵەکا، چونکە مـردن ببووبـووە شـتێکی ئاسایی.

شەقامەکان تا کۆتایی مانگی نیسانی ساڵی ١٩٤٢، هەموویان پاککرانـەوە، هـەموو لاشـەکان فرێدرانـە نـاو خەندەکەکـەی دەوری شـارو بـەگڵ داپۆشـران. هەرچەندە شـەقامەکان بەتـەواوی پاککرابوونـەوە، بـەڵام هێشتا هـەر بۆگـەنی لاشەی مردوویان لێ ئەهات.

بەدوورخستنەوەی لاشەی مردووەکان‌و پاککردنـەوەی شـار لـەمردووەکان، ئازوخەی ئەوکاتەی خەڵکی ناوشار برا[3]..

زۆر کەسی قایمەکار[4]، کە گۆشـتی مردوویـان لـەژێر خـاك‌و ژێـر زەمینـەکانا شـاردبۆوە، بـەهاوکاری یـەکترو پێکـەوە لەگـەڵ یەکـدا ئـەیانخوارد.. ئـەوانیش هیچیان نەشاردبۆوە، دووچاری برسێتی ببووبوون‌و لەسەر شەقامەکان لەبرسانا و بێپەروا پەلاماری نەخۆشەکانیان ئەداو ئەیانکوشتن‌و گۆشتەکانیان ئـەخواردن. یـان بـۆ ئـەوەی گۆشـتەکانیان بخـۆن، ئینجـا خـەڵك بەپەلـە دەسـتیانکرد بـە گـەورەکردنی فرۆکەخانەکـە لـەناو شـارا، فرۆکەخانەکـە بەتـەوای دروسـتکراو

---

[3] مەبەست لەخواردنی گۆشتی مردووەکانە کە ئازوخەی سەرەکی ئەو کاتەی خەڵکی شاربوو.

[4] ئەوکەسانەی زۆر بیر لـەدوارۆژی ئـابووری خۆیـان ئەکەنـەوەو مشوری ژیـان‌و گوزەرانی خۆیان ئەخۆن - وەرگێر-

گەورەكرا، هەرچەند ئەو فرۆكەخانە زۆر سەرەتاییانەبوو، چونكە هیچ پێداویستیو هۆیەكی فرۆكەخانەی تیا نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێت فرۆكە بتوانێت هەرچۆن بێت تیایا بنیشێتەوە.

**فرۆكەخانەكە نە بورجی فەرماندەییكردنی هەبوو نە هەماری سوتەمەنیو نە هۆی پارێزگاریكردنی فرۆكەو نە هۆی پڕكردنەوەی پاترییەكانی.**

لەو باوەڕەدا بووین ئەگەر فرۆكەكان بتوانن بنیشنەوە، ئەتوانن هەموو جۆرە ئازوخەیەك بۆ خەڵكی شار بێنن. بەڵام ئایا فرۆكەكانی ئێمە توانای ئەوەیان هەبوو خۆیان لەفرۆكە جەنگییەكانی ئەڵەمان -لە ئەڵقەی گەمارۆدانەكەی دەوری شار- رزگاربكەنو بگەنە سەر شارو بنیشنەوە؟

بیرمان لەوە ئەكردەوە كە فرۆكەكانی دوژمن چۆن ماوەی ئەوە ئەدەن فرۆكە بارهەڵگرەكانمان بگەنە سەر شارو بنیشنەوە.

**بەرژەوەندیی سەربازی ئەڵەمان وای پێویست ئەكرد كە رێگای هیچ فرۆكەیەكی روسی نەدرێت، بەئاسمانی شاری لینینگراددا بڕواتو لە فرۆكەخانەكەی ناو شاردا بنیشێتەوە..**

رۆژ سیازدەیەمی مانگی مایسی هەمان ساڵ، فرۆكەخانەكە بەیەكجاری فراوانكراو تەوابوو، بەڵام نە ئەو رۆژە فرۆكە هاتنو نە رۆژی دواتر.

هیچ هۆیەكمان بەدەستەوە نەبوو كە بتوانین لێپرسراوانی سەرەوەی دەوڵەت لەبارەی تەواوبوونی فرۆكەخانەكەوە ئاگادار بكەین. رۆژی شازدەیەمی مانگی مایسی ١٩٤٢، سێ فرۆكەی بارهەڵگری خۆمان هاتنە ئاسمانی

شارەکەوە، پۆلێك فرۆکەی جەنگی پارێزگاریان لێئەکردن. لەئاسمانی شاردا، شەڕێکی توند لەنێوان فرۆکەکانی ئێمەو فرۆکە ئەڵەمانیەکانا رویدا، چەند فرۆکەیەکمان کەوتنە خوارەوە، بەڵام هەرچۆن بوو فرۆکەیەکی بارهەڵگر لەفرۆکەخانەکەدا نیشتەوە.

باوەڕبکەن! وەکو چۆن لەچیرۆکە ئەفسانەییەکانا باسی ئەوە ئەکەن ئەگەر یەکێك لەئەستێرەی "مەریخ"ەوە بێت و[5] بنیشێتەوە، چۆن خەڵك بەسەرسوڕمانییەوە لێی کۆئەبنەوەو دەوری ئەدەن و تەماشای ئەکەن، بەوجۆرە خەڵکی شار بەزۆری لەو فرۆکەیە کۆبوونەوە.

لەوکاتەدا کەس بیری لەوە نەئەکردەوە بزانێت ئەو فرۆکەیە بۆچی هاتووە؟ بەڵکو تەنیا ئەوەیان ئەویست فرۆکەوانەکان ببینن بۆ ئەوەی بزانن روخساری خەڵکی ئەودیو ئەڵقەی گەمارۆدانە چۆنە.. ئەو خەڵکەی لەدەوری فرۆکەکە کۆببونەوە، بەرواڵەت زۆر شپرزەو ریش درێژو چڵکن و بۆگەن بوون، هیچ روخسارێکی شارستانێتیان بە رووڵەتەوە نەمابوو.

فرۆکەوانەکان کە ئەو خەڵکە بێ نازەیان بەوجۆرە دی، نەیان وێرا لەفرۆکەکە بێنە دەرەوە، وانێگەیشتن کە ئەو خەڵکە هیچی مرۆڤی شارستانی نین بەڵکو هەموو روخساریان لەپیاوخۆرو دێوو درنج ئەچوو.[6]

[5] هەرچەندە روودانی ئەم کارە ئێستا لەبەر مەودای حوکمی زانستدا کارێکی سادەو ئاسانە....

[6] دێوو درنج نەك بەو مانایە کەلەناو چیرۆك و داستانە ئەفسانەییەکانا هاتووە، بەڵکو بەمانا کەسانی دوور لە شارستانی و دواکەوتوو. وەرگێر.

چاوەڕوانی ئەوەمان ئەکرد فڕۆکەوانەکان بێنە دەرەوەو هەواڵی جیهان‌و ژیانی ئەودیو ئەڵقەی گەمارۆدانەکەمان بۆ بگێڕنەوە، بزانین لەوێ –واتا لەودیو سنووری ئەڵقەی گەمارۆدانەکەوە– ژیان‌و خواردن هەیە، یان ئاگرو سوتەمەنی هەیە خەڵك پێی بژین؟ فڕۆکەوانەکان بەجۆرێك لەخەڵکەکە ئەترسان، ئەگەر ترسی فڕۆکە ئەڵەمانیەکانیان نەبایە یەکسەر بەرزئەبوونەوەو بەجێیان ئەهێشتین.. هەرچەند ئێمە زۆرتر لەفڕۆکەکان نزیك ئەبووینەوە، فڕۆکەوانەکان زیاتر لێمان ئەترسان‌و لەترسانا دەمانچەکانیان دەرئەهێنا بۆ ئەوەی خۆیانی پێ بپارێزن.. ئێمەش –خەڵکی شارەکە– هەموو مەبەستێکمان تەنیا زانینی هەواڵی ژیانی ئەودیو ئەڵقەی گەمارۆدانەکە بوو.. هەرچۆن بوو دەرگای فڕۆکەکەیان کردەوەو فڕۆکەوانێکیان هاواری کرد:

**"ئەوەچیە! چی ڕوویداوە! بۆچی بەئارامی ڕاناوەستن!".**

**خەڵکەکە هەموو بێدەنگ بوون: ئەوانەی خۆیان نوساندبوو بەفڕۆکەکەوە، زۆر بەئارامی‌و لەسەرخۆ دوورکەوتنەوە.**

**فڕۆکەوانەکە وتی:**

**"ئێوە خەڵکی کوێن! بۆچی ڕوخسارتان وای لێهاتووە!!".**

**یەکێك لەخەڵکی شارەکەوتی:**

**"ئێمە ڕوسین، خەڵکی لینینگرادین، خەڵکی ئەم شارەین".**

**فڕۆکەوانەکە وتی:**

**"باشە، بۆچی واتان لێهاتووە!!..".**

**ئینجا هەموو خەڵک بەجارێك وتیان:**

**"چەند مانگە نانمان نەخواردووە ئاومان نییە، چرامان نییە، هیچ پێداویستییەکی ژیانمان نییە، هەموو خزم و کەسوکارەکانمان دۆست و برادەرەکانمان لەم ماوەیەدا لەبرسانا و لەسەرمانا مردوون"..**

**پرسیاریان لەخەڵکەکە کردەوە:**

**"بۆچی مردوون؟!" .. هەموو وتیان:**

**"لەسەرمانا، لەبرسانا، لەبەر نەخۆشی".**

کۆمەڵێك پۆلیس هاتن و خەڵکەکانیان لەدەوری فڕۆکەکە دوورخستەوە، ئینجا فڕۆکەوانەکان داوای ئۆتۆمبێلیان کرد بچن بۆ لای لێپرسراوانی شار، بەڵام پێیان وتن:

"ئۆتۆمبێل نییە، چونکە سوتەمەنی نییە تاکو کاری پێ بکەن".

فڕۆکەوانەکان بەپێ چوون بۆ لای لێپرسراوانی شار، لەبارەی وەزعی شارەکەوە هەموو قسەیەکیان کرد، بەهۆی ئەو فڕۆکەوانانەوە لەهەواڵی وڵات و دنیاو باسی شەڕەکە تێگەیشتین.. ئەوکاتە زانیمان کە ژاپۆن؛ پەلاماری ئەمەریکای داوە، لە ئەنجامدا لەڕۆژهەڵاتی دوور دووچاری شەڕەکە بووە، دەوڵەتی ئەمەریکاو بەریتانیا گەلێك زیانیان لە دەست ژاپۆن پێگەیشتووە، ئەوشمان زانی ئەگەرچی ژاپۆن لەگەڵ ئەمەریکاو بەریتانیادا کەوتۆتە شەڕەوە -کە لەوکاتەدا دوو دەوڵەتی سوێندخوارو هاوپەیمانی ئێمەبوون- بەڵام هێشتا دەستی بۆ ئێمە نەهێناوە.

**دەوڵەتی ژاپۆن وای بیرئەکردەوە ئەگەر لەم کاتەدا -کە ئێمە لەگەڵ ئەڵمانیەکاندا شەڕمانە- ئەگەر ئەویش پەلامارمان بدات، ئەوا ئێمە بەئاسانی لەناوئەچین..**

ئەوکاتە دەوڵەتێکی بەهێزی وەکو ئەڵمان نەبێتە دراوسێی ژاپۆن. کەوابوو باشتروایە بۆ ژاپۆن پەلاماری ئێمە نەدات، بۆ ئەوەی ئەڵمان لەوڵاتی ئێمەدا سەرنەکەوێت. بەلام ژاپۆن ئەوەی نەئەزانی کە ئێمە بەئاسانی لەناوناچین و لەو رادەیەی کە ئەو چاوەڕوانی ئەکات، خۆڕاگرترین.

**ئێمە لەو هەموو برسێتی و باری ژیانە ناهەموارەدا، ئامادەبووین هەموومان بمرین نەك خۆمان بدەین بەدەست ئەڵمانەکانەوە.**

فڕۆکەوانەکان بە بێتەلەکانیان پایتەختیان ئاگادارکرد کە باری برسێتی و مەترسی و مردن لەشارەکەدا چۆنە، و داوایان لەدەوڵەت کرد بەزوترین کات ئازوخەو سوتەمەنی و داوو دەرمان و پێداویستیە گرنگەکانی تری ژیان بۆ دانیشتوانی شارەکە بنێرن: ئەو فڕۆکانەی نیشتبوونەوە، پەتاتەو شەکرو چایان هێنابوو.

لێپرسراوانی شار پەتاتەکەیان دابەشنەکردو بڕیاریانـدا بیچێنن، چونکە زەوی و زارەکانی دەوروبەری شار -ئەوانەی هێشتا نەکەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی ئەڵمانیەکانەوە- هەموو بۆ کشتوکاڵی پەتاتە زۆر باش بوو، چونکە ئەیانزانی تاکو فڕۆکەی ئەڵمان بەسەر ئاسمانی شاردا بسوڕێتەوە، فڕۆکەکانمان ناتوانن بەورادەیە ئازوخە بێنن کە بەشی هەموو دانیشتوانی شارەکە بکات. لەبەرئەوە پێویستە خۆیان خەمی خۆیان بخۆن و درێژە بە کشتوکاڵ بدەن، هەروەها لێپرسراوانی شار هەموو بڕیاریانـدا فڕۆکەکان چەند جارێك لەسەر یەك تەنها پەتاتە بێنن، بۆ ئەوەی لەکەژی بەهاردا بیچێنن.

دوای ئەوەی بەبێتەل هەواڵی شارو ژیانی خەڵکی شار بە پایتەخت ڕاگەیەندرا، دەوڵەت بڕیاریدا گۆشتو ئازوخەی تر بۆ شارەکە بنێرێ، بەڵام لێپرسراوانی شار لەوەڵامدا وتیان:

**"گۆشتمان بۆ مەنێرن، چونکە خەڵکی شار ئەوەندە گۆشتی مردوویان خواردووە، لەوانەیە تا چەند ساڵێکی تریش هیچ جۆرە گۆشتێکمان پێ نەخورێت".**

دوو ڕۆژ دوای ئەوە چەند فڕۆکەیەکی تر هاتن و ئازوخەیان هێنا، بەڵام هەموو جار هەر لەپێنج فڕۆکە دوانیان بەبارەوە ئەکەوتنە خوارەوە، ناو خەتی گەمارۆدانەکە -بەهۆی ئەوەوە کە لەسەر ئەڵقەی گەمارۆدانەکە ئەڵەمانیەکان تەقەیان لێئەکردن- لەمانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٢دا، بەهۆی گەرمی و توندوتیژی باری شەڕەکەوە، لەهەموو بەرەکانی وڵاتدا، ئەڵەمانییەکان ناچاربوون هێزی هەوایی -یان هێزی ئاسمانی- لەدەوروبەری شارەکە کەمبکەنەوەو فڕۆکەکانیان بنێرن بۆ شەڕی بەرەکانی تر. بەمکارە باری خەڵکی ناو شار کەمێك ئاسان بوو، ئەوکاتە فڕۆکەکانمان لەجاران باشتر ئەیانتوانی هاتوچۆ بکەن و لەناو شاردا بنیشنەوە.

خەڵکی شار بەگەورەو بچوکەوە دەستیان کرد بەچاندنی پەتاتە، چەندان کێڵگەی گەورەو بچوك لەدەوروبەری نزیکی شاردا چێنرا، هەرچەند بەهۆی نەبوونی سوتەمەنییەوە مەکینەی جوتکردن نەبوو، بەڵام بەپاچ و بەبێڵ زەوییەکانیان ئەکێڵا.

فڕۆکەکانی ئەو سەردەمە، وەکو ئێستا بەهێز نەبوون کە بتوانن باری گەورە هەڵبگرن، جگە لەوەی کە ئەبوا بەناو ئاگری شەڕەکەدا بهاتبانایە. هەر

لەبەر ئەمەش بوو، لێرسراوانی شار بەڵێنی نانی تەواویان بەدانیشتوانی شارەکە نەئەدا.

باری چۆنێتی شەڕەکە ئەوەی نیشان ئەدا کە زستانی داهاتووش شارەکە لە گەمارۆی شەڕ رزگاری نابێت.. خەڵک هەرچی سوتەمەنی هەبوو زستانی رابوردو هەمووی سوتاندبوو.. تەنیا دارستانە دەوڵەتییەکانی دەوروبەری شار مابوونەوە کە ئەوانیش زۆربەیان بەدەست لەشکری ئەڵەمانییەکانەوە بوون. ئەگەر سوتەمەنی نەگاتە شار، زستانی داهاتوو خەڵکەکە هەموو ئەمرن لەسەرمانا.

بریار وابوو ئەگەر دەوڵەت نەتوانێت ئەو ئەڵقەی گەمارۆدانە بشکێنێت، ئەوا پێویستە خەڵکی شار لەلایەکەوە دوژمن بەرەو پاش ببەن بۆ ئەوەی ئەو دارستانانەی کە ئێستا بەدەست دوژمنەوەن، بکەونەوە دەست خەڵکی شارو بیانکەن بەسوتەمەنیی زستانی داهاتوویان، تاکو لەسەرماناو لەبرسانا نەمرن.

لەرۆژی ١٥ی مانگی ئابی سالی ١٩٤٢دا، سوپای بەرگریی داکۆکیکاری شارو خەڵکی شار بەگەورەو بچوکەوە، پەلاماری لەشکری ئەڵەمانییەکانیان داو چەند کیلۆمەترێك لەکەناری شاریان دوورخستنەوەو ئەو بێشەو باخ و دارستانانەی لەنزیك شارەوە بوون، کەوتنەوە دەست سەربازو خەڵکی شارەکە.خەڵکەکە بەدەستاویرنو ئازایانە بڕیو هەموویان بەکۆڵ هێنایە شارەکەوە، لەماوەیەکی کەمدا ئەوەندەیان دار هێنا کە ئەتوت بەشی هەموو زستان ئەکات.

خەڵکی شار بەزۆری بیریان لەوە ئەکردەوە هەندێك لەو کارخانانە کە بەئاگری خەڵوزی بەردی کاریان ئەکرد، بەدار بیانخەنەوە کار.

## بەشی چوارەم

## چەند پەلامارێکی زۆرکەوتوانەی ئەڵمانەکان و گەڕانەوەی روخساری ژیان بۆ ناو شار

## کۆتایی شەڕ-

کاتێك پەلاماردانی ئەڵمانیەکان دەستیپێکرد، هەموو ئەو کەسانەی توانای پەلاماربردنیان هەبوو بۆ سەر ئەڵمانیەکان ئامادەبوون، هەندێك چونە ناو سەنگەرەوە، هەندێکیش سەنگەری تازەیان دروستکرد.. ئێمە بەپێی تاقیکردنەوەی رابوردو، ئەوەمان ئەزانی کە ئەڵمانییەکان ناتوانن لەخەندەکەکە بپەڕنەوە بۆ ناو شار، بەڵام -لەگەڵ ئەوەشدا- بەوە دەستەرۆنەبووین، لەناو شاردا گەلێك سەنگەرمان لەسەر شەقامەکان و کۆڵانەکاندا دروستکرد، بۆ ئەوەی ئەگەر ئەڵمانییەکان هاتنە ناو شارەوە سەنگەر بەسەنگەر بەرگریيان لێ بکرێ.. چونکە ئێمە هەر لەسەرەتای شەڕەکەوە ئەو بڕیارەمان دابوو، ئەگەر هەموومان بکوژرێین خۆ نەدەین بەدەستەوە.

ئەو گوللە تۆپانەی دوژمن ئێمەی نەئەترسان، چونکە ئێمە بەرلەوکاتە ئەوەندە سەمەرەی تاڵمان بەسەردا هاتبوو، هەرگیز لەگوللە تۆپ نەئەترساین.

ئەڵمانیەکان چەند جارێك پەلاماریان داین: ئەیانویست بێنە ناو شارەوە، بەڵام ئێمە خوارگرانە بەرهەڵستیمان ئەکردن، ئێمە دوو کارخانەی کارەبامان بەدار خستە کارکردن، بەو هۆیەوە کارمان پێشتر کەوت: ئەڵمانیەکان هەفتەیەك لەسەر یەك شەو رۆژ پەلاماریان ئەداین. دوو جار ویستمان بەچەتریازی پشتمان لێ بگرن، بەڵام ئێمە هەردوو جارەکە سەربازە چەترەوانەکانمان ئەکوشت و چەند کەسێکمان لێ بەدیل ئەگرتن، گەلێك زانیاریمان لەبارەی شەڕو جۆری چەك و چەندایەتی ئەڵمانییەکانەوە لەدیلەکان وەرگرت.

## دیلەکان ئەیانوت:

ساڵی پارەکە، سێ لەشکر بووین بەڵام ئێستا ژمارەمان کەمبۆتەوە، زۆربەی هێزەکانمان رۆیشتن بۆ بەرەکانی تر بۆ شەڕکردن.

لەسەرەتای زستانی ساڵەکانی ١٩٤٢-١٩٤٣دا، ئەڵەمانییەکانو فنلندییەکان زیاتر لە ٢٠ لەشکریان لەدەوروبەری شار هەبوو، چوار لەشکریان فنلندیو شازدەشیان ئەڵەمانی بوون.

بەداخەوە، کەئێمە لەشکری زرێدارمان نەبوو، ولتا تانکو زرێپۆشو چەکی قورسمان نەبوو.. ئەگەرنا ئەمانتوانی لەشار بچینە دەرەوەو ئەو ئەڵقەی گەمارۆدانە بشکێنین.

زستانی دووەم هەرچەند هێشتا گەمارۆدرابووین، بەڵام بەهۆی بوونی کارەباوە دەزگای رادیۆمان کاری ئەکردو هەموو هەواڵێکی دەرەوەی شارو جیهانمان ئەزانی.

بەهۆی رادیۆی لەندەنەوە، هەواڵمان زانی کە هاوپەیمانەکان لەشکری خۆیان گەیاندۆتە ئەفەریقاو لەوێ بەرەیەکی تری شەڕیان دامەزراندووە، هەروەها بەهۆی رادیۆوە هەواڵی بۆمبارانی شارەکانی ئەڵەمانیای رۆژئاوامان ئەزانی، بەتایبەتی شارە سنعەتییەکانیان.

هەندێک جار هەواڵمان وەرئەگرت، گوایە هەندێک شەو هێزی ئاسمانی ئینگلیز حەوت سەد تا هەشت سەد، هەندێک جاریش هەزار فرۆکەی بۆمباهاوێژی ناردۆتە سەر شارەکانی ئەڵەمانیای رۆژئاوا.

لە رادیۆی لینینگرادەوە، هەموو جار هەواڵمان بەپایتەخت ئەگەیاندو هەواڵیشمان لێ وەرئەگرتنەوە.. ئەیانوت لەکاتی شەڕدا نابێت ئێستگەکان کار بکەن، ئەوەک دوژمن بیاندۆزێتەوەو بیانشکێنێ؛ بەڵام ئێمە هەر کارمان پێ ئەکردن.

لەزستانی ساڵی ١٩٤٢- ١٩٤٣دا، لەشکری ئەڵەمان چەند جارێك شارەکەی بۆمباران کرد، لەهەمان زستانا سوتەمەنیمان زۆربوو لەو رووەوە بێ خەم بووین، لەگەڵ ئەوەشدا زستانەکە وەك ساڵی رابوردو سارد نەبوو، ئەو ساڵە هیچ کەس نە لەسەرماو نە لەبرسانا نەمردن، بەڵام ئاوی خواردنەوەمان زۆر کەم بوو، هەروەکو ساڵی رابوردوو بەفرمان ئەخواردو بەفرمان ئەتواندەوە.

**مژدە:**

رایۆی پایتەخت مژدەیدا کە لە خواروی وڵاتدا لەشکرێکی گەورەی ئەڵەمان خۆی داوە بەدەستەوەو لەهاوینی داهاتوودا هەموو ئازوخەیەك بەرێگای زەمینیدا ئەگاتە شارەکان.

ئازوخە بەجۆرێك ئەگەیشتە لامان، ئەبوا ئەو ئابلۆقەی گەمارۆدانەی ئەڵەمانیەکان بشکێتو رێگاکە بکرێتەوە، ئینجا بەئەندازەی پێویست ئازوخە ئەگا‌ ، ناو شار.

ئێمە بیرمان لەوە ئەکردەوە کەدەوڵەت ئەیەوێ لەهاوینی داهاتوودا ئەو ئەڵقەی گەمارۆدانە بشکێنێ؛ باری چۆنێتی بەرەکانی شەڕ لەلایەن هێزەکانمانەوە لەهەموو لایەك باش بووبوو، تەنیا لای ئێمە نەبێت.

لەخوارووی وڵاتدا هێزی دوژمن لەناوچووبوو، ئەوەی مابۆوە خۆی دابوو بەدەستەوە، لەناوەراستی وڵاتیشدا سوپای وڵات لەشکری ئەڵەمانی بەرەو دواوە ئەشکاندەوەو ئێمەش بەهیوابووین هاوینی داهاتوو گەمارۆدانەکەمان ئەمێنێ.

لەبەهارو هاوینی ساڵی ١٩٤٢دا، هەروەکو ساڵی رابردو پەتاتەو ماشمان ئەچاند بۆ ئەوەی بۆ زستان ئازوخەمان هەبێت، هەروەها دارمان کۆئەکردەوە بۆ ئەوەی زستان سەرمامان نەبێت.

## هەواڵێکی خۆش:

لەهاویندا هەواڵێکی زۆر خۆشمان پێگەیشت کەپەلاماربردنی ئەڵەمانیەکان لەناوەندی وڵاتدا شکاوەتەوە، ئەمە دواپەلاماری ئەڵەمانیەکان بوو لەوڵاتدا، دوای ئەوە لەشکرەکانی ئەڵەمان توانای پەلاماردانیان نەما، تا ئەوکاتەی بەرلین خۆیدا بەدەست لەشکری هاوپەیمانەکانەوە.

ئەڵەمانیەکان لەبەرەی شەڕی "کورسک بیلگورد"دا لە هاوینی ساڵی ١٩٤٢، چوار هەزار تانکیان بەکارهێنابوو[1]

لەکاتی گەمارۆدانەکاندا، لەسەرەتا سەربازەکانی وڵات کە داکۆکیان لە شارەکەمان ئەکرد ئازوخەیان هەبوو، بەڵام دواتر ئەوانیش بێ ئازوخە کەوتن وەک خەڵکی شار دەستیان کرد بە خواردنی گۆشتی مردووەکان.

خەڵکی شار هەندێک لولەی ئاویان چاککردەوەو بەو هۆیەوە ئاو ئەگەیشتە هەندێک لەگەڕەکەکانی شار.. رۆژێک کە بەفر ئەباری، لەبەری رۆژهەڵاتی شارەکەمانەوە دەنگی دەستڕێژو تۆپ و شەستیر ئەهات، رادیۆ بڵاویکردەوە کە سوپای وڵات بەدرێژایی دەریاچەی "لادوگا" کە کەوتۆتە بەری رۆژهەڵاتی شارەکەوە، پەلاماری لەشکری ئەڵەمانی داوە بۆ ئەوەی شارەکە رزگار بکات.

**ئێمە کە ئەم هەواڵەمان بیست، دەمودەس کەوتینە خۆ، لەپشتەوە پەلاماری لەشکری ئەڵەمانمان داو لەشکری ئەڵەمان کەوتە نێوان دوو ئاگرەوە..**

---

[1] ئەم ژمارەیە بۆ ئەو کاتە گەلێک زۆر بووە. - وەرگێر-

لەیەکەمین رۆژەکانی سالی ١٩٤٤دا، سوپای ولات لەبەری رۆژھەلاتو ئێمەش لەناوەوە پەلاماری ئەلەمانیەکانمان داو لەشکری ئەلەمانمان شکاندو چاومان بەبینینی سوپای ولاتەکەمان رووناکبۆوە.

کەرێگا کرایەوەو ئازوخە گەیشتە شار، بەگورجی نانەولخانەکان دەستیان کرد بەنانکردنو هەر کەس هەر رۆژە دەسەندەی تەسەلی ناتی خۆی وەرئەگرت.

باری ژیان جارێکی تر ئاسایی بۆوە، دەولەت بریاریدا پۆستە بەپۆستە خەلکی شارو ئەو سەربازانەی لەشارەکەدا بوون، بیانتێرێ بۆ ناوچەکانی تر بۆ ئەوەی بێنەوە سەرخۆ: چونکە خۆراگرتنی سێ سالو خواردنی گۆشتی مردووسەرماو سۆلەو هەزاران جۆر نەخۆشی، بەجۆرێك کاری کردبووە سەر روخساری خەلکی شارەکە، کەبەئاشکرا شێتیو ماندوێتیو نەخۆشی لەروالەتیانا بەدی ئەکرا.

زۆری پێ نەچوو لەشکری ئەلەمان بە شپرزەییەوە دەوری شارەکەی بەجێهێشتو بەیەکجاری گەرایەوە.

## فەرهەنگۆک

**ئەو وشانەی وشەی تریان لەجێگادا دانراوە، ئەمانەن:**

ئاناتۆل داروّف- من

لینینگراد- شارەکە

روسیا- وڵات

بەریتانیا- ئینگلیز

دەوڵەت- خۆمان

نیسان- ئابریل

حوزیران- ژوئن

تەمموز- ژوئیە

مایس- مەی

ئاب- ئاوت

خەڵکی شار- ئێمە

# پێرست

**بەشی چوارەم:**



**سوپاس:**

زۆر سوپاسی برایانی هونەرمەندو خۆشنوس کاك نەوزاد توفیق و کاك ئەحمەد سەعید ئەکەم ناونیشانی کتێبەکەیان (چاپی یەکەم) بۆ نوسیم.

-وەرگێڕ-

## لەبەشی دووەمی کتێبەکەوە:

بەشێکی زۆری خەڵکی شار بیریان لەوە کردبۆوە کە بەهار هاتو هەوا گەرم بوو، لاشەی مردووەکان بۆگەن ئەکەنو هەزاران جۆر نەخۆشیان لێدەکەوێتەوە، بۆیە زۆربەیان کەوتنە خۆ لەژێر خانە سارددەکانا چاڵیان هەڵئەکەندو لاشەی مردووەکانیان تیائەشاردەوەو پاشەکەوتیان ئەکردن بۆ ئەوکاتەی کە هەوا گەرم ئەکاتو گۆشتی سەر شەقامو کۆڵانەکان بۆگەن ئەکەن. کاتێکیش گۆشتی مردوو خواردن بوو بەشتێکی ئاسایی، ئیتر ئەوەندە خەڵك لەبرسانا نەئەمردن.

## لەبەشی سێیەمی کتێبەکەوە:

دوای ئەوەی بەبێتەل هەواڵی شارو ژیانی خەڵکی شار بە پایتەخت راگەیەندرا، دەوڵەت بڕیاریدا گۆشتو ئازوخەی تر بۆ شارەکە بنێرێ، بەڵام لێپرسراوانی شار لەوەڵامدا وتیان:

"گۆشتمان بۆ مەنێرن، چونکە خەڵکی شار ئەوەندە گۆشتی مردوویان خواردووە، لەوانەیە تا چەندساڵێکی تریش هیچ جۆرە گۆشتێکمان پێ نەخورێت".

نرخ: دوو هەزار دینار